سەردەمی گوڵین-٢

حەزرەتی

# ئەبوبەکر

ڕەزای خوای لێبێت

ڕوحی دەمیرەل





سەردەمی گوڵین -٢-

حەزرەتی

# ئەبوبەکر

ڕەزای خوای لێبێت

ڕوحی دەمیرەل




# سەردەمی گوڵین
# ٢
## حەزرەتی ئەبوبەکر
## ڕەزای خوای لێبێت

نووسینی: ڕوحی دەمیرەل
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: مایس - ٢٠١٤
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی
(٢٧٥)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە
تیراژ: ٥٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# ناوەرۆک













# حەزرەتی ئەبوبەکر

دوو ساڵ بەسەر ڕووداوی فیلدا تێپەڕی بوو. ساڵی (٥٧٣)ی زایینی بوو. ئاووهەوای مەککە ئەوەندە گەرم بوو، خەڵکی لە سێبەرەکانیشدا فێنکیان نەدەبووەوە. بۆیە هەندێکیان سەر و ملیان تەڕدەکرد و هەندێکی تریشیان خۆیان باوەشێن دەکرد.

ڕۆژێکیان پیاوێك وەك هەورە بروسکە و بە شپرزەیی بەناو بازاڕی

مەککەدا ڕای دەکرد و دەیوت:

- ئەبو قوحافە مزگێنیم بدەرێ! کوڕێکی جوانکیلەت بووە.

ئەبو قوحافە بە جۆرێك شڵەژا نەیدەزانی چی بکات. سەرەتا شادییەک دڵی گرتەوە. بەڵام ئەوەندەی نەبرد شادی جێی بۆ دڵتەنگی جێهێشت. چونکە ئەبو قوحافە بەدەم وەڵامدانەوەی پیرۆزبایی هاوەڵانی دەورووبەرییەوە ئەم دوعایەی لەزار هاتەدەر: "هیوادارم ئەمیشیان وەك ئەوانەی تر، نەمرێت."

بە بیستنی ئەم هەواڵە بەخێرایی گەڕایەوە ماڵەوە. کۆرپەی نازداری لە سەلمای خێزانی وەرگرت و بە سۆزەوە لە باوەشی گرت. پاشان کەشی شادی لەناو ماڵدا بڵاوبووەوە.

پاش چەند ڕۆژێك سەلما خاتوون کۆرپەی نازداری پێچایەوە و هاودەم لەگەڵ هەستێکی ئاڵۆزی تێکەڵ لە خەم و خۆشی لە ماڵ چووەدەر. بەنیازبوو جگەرگۆشەکەی ببات بۆ کەعبە. کاتێك لە دەروازەکەوە ڕۆیشتە ژوورەوە، هەر ئاوڕیشی نەدایەوە بەلای ئەو بتانەدا کە لەو ناوەدا ڕیزکرابوون. ڕاستەوخۆ ڕووی کردە کەعبە. خاتوو سەلما بەهێواشی منداڵەکەی بەرزکردەوە و لە قووڵایی دڵەی سووتاویەوە دەستی کرد بە دوعا و پاڕانەوە، بە فرمێسکەکانیشی داواکارییەکەی قووڵتر دەکردەوە و دەیوت:

- ئەی پەروەردگاری کەعبە، هەموو کوڕەکانی پێشوومت بردووەتەوە بۆلای خۆت. بە نسیب نەبوو هیچ کامیان بە گەورەیی ببینم. لێت دەپاڕێمەوە، ئەم کوڕەیانم بۆ بهێڵیت. خودایە! تەمەن درێژی بکەیت.

ئەوە بوو لەو کاتەدا کە ویستی هەستێت و بەرەو ماڵ بگەڕێتەوە، دەنگێکی زۆر سەیر و نامۆ دایچڵەکاند. دەنگەکە دەیوت: "ئەی بەندەی خوا! خەمت نەبێت، داواکەت وەرگیرا. کوڕەکەت دەژی. دەشبێتە نزیکترین هاوەڵی نێردراوی خوا."

خاتوو سەلما نەیدەزانی چی ڕوویداوە. سەرسامانە سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. بەڵام کەس لەو ناوە نەبوو. جا خۆ دەنگەکەش دەنگی کەسێکی ئاسایی نەبوو. بۆیە دەستبەجێ خۆی دا بە زەویدا و لەتاو ئەو مژدەیە سوجدەی شوکری برد. دواتر هەستایەوە و ڕێی ماڵی گرتەبەر. لە دڵی خۆشیدا بڕیاری دا کە ئەو ڕووداوە لەلای کەس نەدرکێنێت. لە دوای ئەو ڕۆژەوە منداڵەکەی وەك چاوی خۆی دەپاراست. زۆر بەئاگادارییەوە ڕۆڵە ئازیزەکەی گەورە کرد.

چ کات ئەبو قوحافە و سەلما تەماشای عاتیقی کوڕیان بکردایە، تنۆک تنۆک شادمانی دەچۆڕایە دڵیانەوە و سوپاسی خوایان دەکرد لەسەر مانەوەی جگەرگۆشەکەیان لەژیاندا.

عاتیقی بچکۆلە کە لە داهاتودا دەبوو بە ئەبوبەکر، کاتێك گەیشتە ئەو تەمەنەی کە زمانی بپژێت و بتوانێت دەردی دڵی خۆی بدرکێنێت، لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەستی کرد بە یاری کردن و ڕاکەڕاك لە کۆڵانەکاندا. لەناو هاوڕێکانیدا کەسێکی زۆر خۆشەویست بوو. تەنانەت دانیشتوانی گەڕەکەکەیش بە ستایشەوە باسیان دەکرد. خوازیاربوون منداڵەکانیان وەک عاتیق ڕەوشت بەرز و ئاکار سەنگین بێت.

* * *

# بتەکان

ڕۆژێکیان ئەبو قوحافە بەخێرایی هاتەوەماڵەوە. شپرزی بە ڕوخساریەوە دیاربوو. لە کوڕەکەی نزیك بووەوە و بە دەنگێکی پڕ لە سۆزەوە وتی:

- دەی ئازیزەکەی بابە با بڕۆین بۆ سەردانی کەعبە. ئەمڕۆ خواوەندە گەورەکان دەهێننە دەرەوە.

عاتیق بەقسەی باوکی کرد و لەسەرخۆ کەوتە خۆ ئامادە کردن. ئینجا پێکەوە ڕێی کەعبەیان گرتەبەر. بەگەیشتنیان، ئەبو قوحافە پەیکەرە کۆنەکانی پیشاندا و وتی:

- بڕوانە کوڕم، ئەمانە خواوەندەکانی ئێمەن! لە گشت کاروبارەکانماندا یارمەتیمان دەدەن. کەمتەرخەمی ناکەین لە بەگەورە زانینیاندا و لەبەردەمیاندا چۆك دادەدەین ودەیانپەرستین. کوڕم ئیتر کاتی ئەوە هاتووە تۆش خواوەندەکانمان بناسیت. ئەو خواوەندەی دەیبینی ناوی هوبەلە... ئەمەش عوززایە... ئەوەی دواوە لاتە... ئەوەی تەنیشتیشی مەناتە. باش بیانناسە! ئەوانە گەورەترین خواوەندەکانمانن.

کاتێک ئەبو قوحافە ئەم شتانەی باس دەکرد، عاتیقی بچکۆلە سەرنجی دابوویە جێیەکی دیکە. چاوی بڕیبووە ئەو پیاوەی خەریکی تاشینی بەردەکان بوو. کابرای بەردتاش سەرگەرمی داتاشین و پەیکەرسازی ئەو بەردانە بوو کە لە بیاباندا دۆزیبوونیەوە. پاش ماوەیەکی کەم کە پەیکەری بەردینی خواوەندەکان تەواو دەبوو، خەڵکیش دەهاتن و لەبەردەمیاندا چۆکیان دادەدا و دەپاڕانەوە و داوای قبوڵبوونی نزاکانیان دەکرد.

بۆیە باوکی لێیپرسی:

- کوڕم خۆ گوێت لە قسەکانم بوو، وانییە؟

عاتیق ڕووی وەرگێڕا و تەماشای ئەو بتانەی کرد کە باوکی ئاماژەی بۆکردبوون. شکڵ و شێوەشیان هیچ جوان نەبوو. لە دەموچاویاندا سیمایەکی ترسناک بەدی دەکرا. سەرەڕای ئەو هەموو پێداگرییەی باوکی، کەچی عاتیق لەبەردەم بتەکاندا نەچەمایەوە و گرنگی پێنەدان.

ئەبو قوحافە کوڕەکەی لەوێ بەجێ هێشت و گەڕایەوە سەر کارەکەی. عاتیقیش ئەمەی بە هەل زانی بۆیە یەکسەر لە یەکێک لە بتەکان نزیك بووەوە و پێی وت:

- زۆرم برسییە. دەتوانیت خواردنم بدەیتێ؟

بتەکە نقەی لێوە نەهات. ئەمجارەیان وتی:

- کەوایە ئاوم بدەرێ!

بتەکە ئەمجارەش دەنگی لێوە نەهات. ئەوجا عاتیق ڕووی کردە

بتێکی تر و وتی:

- ئادەی تۆ ئەی بت، گەر لەتواناتدایە پۆشتەم بکە!

لەمیشیان هیچ وەڵامێکی وەرنەگرت. لە ڕاستیدا ئەم بتانە کە لە دار و بەرد دروستکرابوون هیچ جیاوازییەکیان نەبوو لەگەڵ بێگیانەکاندا. بێ هیچ جوڵە و بزاوتێک هەروا بۆخۆیان وەستابوون. عاتیقی بچکۆلە ئەمجارەیان بەردێکی هەڵگرت و چووە بەردەم بتێکیان کە مێش و مەگەز لە ڕوخساری ئاڵابوو، پێی وت:

- ئێستا ئەم بەردەت تێ دەگرم، ئەگەر هەر بەڕاستی خوایت، ئەوا پارێزگاری لەخۆت بکە!

ئەوەبوو بەتووندی بەردەکەی دا بەسەروچاوی بتەکەدا. ئەوانەی چاویان بەم دیمەنە کەوت، بێ یەک و دوو هەواڵەکەیان گەیاندە باوکی. ئەبو قوحافە بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە شوێنی ڕووداوەکە. زۆر سەری سووڕما لەو ڕەفتارەی کە کوڕەکەی بەرامبەر بە بتەکان نواندبووی. بۆیە قۆڵی گرت و خێرا بردیەوەماڵەوە.

لەماڵەوە ڕووداوەکانی بۆ سەلمای خێزانی گێڕایەوە. بە دوودڵییەکەوە وتی:

- ئافرەت دەترسم ئەم منداڵە خواوەندەکانمان نەپەرستێت!

خاتوو سەلما بە بیستنی قسەی هاوسەرەکەی ئەو دەنگەی بیرکەوتەوە کە پێش چەند ساڵێك لە کەعبە گوێی لێ ببوو. بۆیە دەستی هێنا بەسەری کوڕەکەیدا و پشتگیری لێکرد:

- پیاوەکە واز لەو منداڵە بهێنە. چۆنی پێ خۆشە با وا بکات.

ئەوەی لەسەر تۆیە ئامۆژگاری کردنیەتی، ئیتر خۆی سەربەستە لەوەی چ ڕێیەک هەڵدەبژێرێت. تکا دەکەم زۆر لە کوڕەکەم مەکە و هەراسانی مەکە.

* * *



# شوان

دایکی وتی:

- کوڕم، عاتیق! وەرە ئەم گۆشتانە بەسەر دراوسێکاندا دابەش بکە و سەلامی منیشیان پێ بگەیەنە.

عاتیقی بچکۆلە سینیەکەی هەڵگرت و بۆماوەیەک تەماشای ڕووخساری دایکی کرد. کاتێك دایکی ڕوانینی پڕ سۆزی کوڕەکەیی بینی، بەسەری ئاماژەی بۆ دەرگاکە کرد و وتی:

- ئازیزەکەم خۆت خەریك مەکە و چی زووترە برۆ دابەشیان بکە و وەرەوە. دواییش بچۆ ئاژەڵەکان بلەوەڕێنە. پێش ئەوەی زۆر گەرم بکات بکەوەرە ڕێ.

عاتیق بەڕاکردن چووە دەرەوە. گۆشتەکەی بەسەر دراوسێکانیاندا دابەش کرد. هاوسێکانیش لەبەرامبەر ئەم چاکەیەدا سوپاسگوزاری خۆیان دەربڕی.

دراوسێکان خۆشحاڵی خۆیان نیشاندا و بە عاتیقیان وت:

- سوپاسی دایکت دەکەین! بەڕاستی لەخۆڕا پێی ناڵێن دایکی چاکە! چونکە هەرکەسێک لە کێشەدا بێ، بەدڵنیاییەوە ئوممولخەیریش لەوێیە و هاوکاری دەکات. لەبەر چاکی و چاکەخوازی "خاتوو سەلما" دانیشتووانی گەڕەك ناویان لێنابوو "ئوممولخەیر" واتە "دایکی چاکە" .

کاتێك عاتیقی لە دڵان خۆشەویست هەموو گۆشتەکەی دابەشکرد و بە سینییە بەتاڵەکەوە گەڕایەوە ماڵەوە، بینی وا باوکی چاوەڕێی دەکات. چونکە لەسەر ڕێ بوو تاوەکو بۆ بازرگانی بچێت بۆ یەمەن. لە دوا ساتەکانی خۆکۆکردنەوەیدا بانگی لە کوڕەکەی کرد:

- دەی کوڕم، مێگەلەکە لە گەوڕەکە بهێنە دەرەوە، بیانبە لە

مێرگدا بیانلەوەڕێنە و ئاویان بدە. بەڵام ئاگاداربە زۆر لەبەر گەرمادا نەمێننەوە، نەوەک خۆر بیانبات. زۆریش مەیان گەڕێنە، با ماندوو نەبن.

ڕۆژانە عاتیقی بچکۆلە مێگەلەکەی پێش خۆی دەدا و دەیبردن لە دەرەوەی مەککە دەیلەوەڕاندن. کاتی نیوەڕۆش دەچوونە بەر سێبەر و دەحەسانەوە.

ئەم ژیانە ئاساییە بۆ ساڵانێکی زۆر بەردەوام بوو. تا ئەوەبوو عاتیقی بچکۆلە بوو بە هەرزەکار و ناویشی بوو بە ئەبوبەکر.

* * *



# کاروان

لای هەمووان زانراوە کە بژێوی خەڵکی مەککە لەسەر بازرگانی کردن بوو. کاروانیان ڕێکدەخست و بەمەبەستی کڕین و فرۆشتنی شمەک و کەلوپەل دەچوون بۆ ناوچەکانی دەوروبەریان و مامەڵەی بازرگانیان لەگەڵ دەکردن.

ئیتر حەزرەتی ئەبوبەکریش گەیشتبووە تەمەنێک کە بتوانێت لەم کاروانانەدا بەشداری بکات. کەلوپەلێکی زۆر و زەبەندەی دەکڕی و لەگەڕانەوەشدا بە ماوەیەکی کەم هەمووی دەفرۆشتەوە. کارەکانی زۆر بەباشی بەڕێوەدەچوو چونکە جێی متمانەی خەڵکی بوو.

لەیەک لەو ڕۆژە گەرمانەی هاویندا کە خۆر لەناو جەرگەی ئاسماندایە و لەسەری مرۆڤەکان جیا نابێتەوە، کاروانێکی درێژ لە مەککەوە بەرەو باوەشی گەرمی بیابانی وشک و برنگ کەوتە ڕێ. کەش و هەوا هێندە گەرم بوو خەریك بوو دەیبرژاندن.

پاش ماوەیەک کاروانەکە لە شوێنێکدا مۆڵی دا. دەستوبرد سایەکانیان هەڵدا و بە هەڵەداوان خۆیان لە تینی بەتینی خۆرەکە شاردەوە.

یەکێك لە ناویاندا وتی:

- دەی خێرابکەن! با خواوەندەکانمان دەربهێنین و بکەوینە پاڕانەوە لێیان!

لەولاتریشەوە پیاوێک کە ژیری لە ڕوخساریدا دەخوێنرایەوە تەماشای ئەو دیمەنە نامۆیەی دەکرد. ئەو پیاوە لاوازە باڵا ناوەندە دەموچاو سپی و ڕیش ڕەشە، حەزرەتی ئەبوبەکر بوو. ئەوان سەرقاڵی قسەکردن بوون و ئەمیش بۆی دەڕوانین. زۆری نەخایەند چەند بتێکیان دەرهێنا کە لە حەڵوا دروستیان کردبوون و لەبەردەمیاندا کەوتنە سەرچۆک و دەستیان کرد بە کڕوزانەوە لێیان. تۆ وەرە بڕوانە داوای گیرابوونی نزاکانیان لەم بوونەوەرە بێ

گیانانه دەکرد کە بە دەستی خۆیان دروستیان کردبوون. هەندێکیان داوای قازانجی زۆریان دەکرد، هەندێکی تریان بۆ ئەوە دەپاڕانەوە نەخۆشیەکەیان چاک ببێتەوە. بگرە هی وایان تێدابوو، داوای دەکرد لە ئاسمانەوە پارە ببارێت.

بەتەمەنترین کەس لەنێویاندا وەک ئەوەی بیەوێت سەرنجی ئامادەبووان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، کۆکەیەکی کرد، پاشان وتی:

- بۆ ئەمڕۆ ئەمەندە پەرستش بەسە، ئێستا کاتی خواردن و خواردنەوەیە!

ئیدی نۆرەی گاڵتە و گەپ و ڕابواردن بوو. ڕاستەوخۆ کەوتنەخۆیان و پەلاماری ئەو بتانەیان دا کە لە گەرمادا تواوبوونەوە. بتە خواوەندەکان کە لە حەڵوا و شیرینی دروستکرابوون بەدەم قاقاوە پارچە پارچە کران و قوت دران. ئەو پەیکەرە بێ گیانانەی کەوا کەمێك پێش ئێستا لەبەردەمیاندا چۆکیان دادابوو و لێی دەپاڕانەوە، وا ئێستا کەوتبوونە ژێر سۆزی ددانیانەوە. کاروانچییەکان بەدەم خواردنەوە سەرگەرمی گاڵتە و گەپ و گێڕانەوەی نوکتە بوون.

- ئەم خواوەندەیان دوێنێ ئێوارە هاوسەرەکەم بۆی دروست کردم. چۆنە بەلاتانەوە؟

کاروانچییە پیرەکە بەدەم بادانی سمێڵیەوە هاتەگۆ:

- ئەوە چ قسەیەکە گیانە، خەریکە پەنجەی خۆمی پێوە دەخۆم! هاهاها! بەڵام بۆ جاری داهاتوو، با کەمێك شەکری زیاتر بێ.

یەکێک لە کاروانچییەکان کە شەرابەکەی ناو دەمی دەتکایە ناو بەرۆکی، بانگی لە حەزرەتی ئەبوبەکر کرد و وتی:

- هێی، کوڕەکەی ئەبو قوحافە! لە حەڵواکەت نەخوارد. باشە وتمان خواوەندەکانمان ناپەرستیت، بەڵام بۆچی مەی ناخۆیتەوە؟ دە وەرە هەر هیچ نەبێ قومێکمان لەگەڵدا بخۆرەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر بەجۆرێك تەماشای بادەی کابرای کرد، دیار بوو کە بێزی لێ دەکاتەوە. ڕێك لەو کاتەدا کە ئەبوبەکر دەیویست وەڵام بداتەوە، یەکێکی تریان بەدەم قوتدانی شەرابەکەیەوە وتی:

- دەڵێی ئەبوبەکر ناناسیت؟ ئەو هەروەك چۆن خواوەندەکانمان ناپەرستێت، بەهیچ شێوەیەکیش دەم بۆ شەراب نابات. بەدرێژایی ژیانی کەس نەیدیوە شەرابی خواردبێتەوە.

یەکێکی تریان بەدەم سڕینی دەمیەوە خۆی خستە ناو باسەکەوە:

- وەڵڵا ئافەرین! تا ئەم تەمەنە بۆ جارێکیش بێت نەیخواردووەتەوە. یەکێکە لەو چوار پێنج کەسەی کە لەو مەککە گەورە و گرانەدا تامی مەشروبیان نەکردووە. هاوڕێ نزیکەکەشی، مەبەستم لە موحەمەدە تا ئێستا ئەویش دەمی بۆ مەی نەبردووە.

لەبەرامبەر هەمووو ئەمانەدا حەزرەتی ئەبوبەکر بێدەنگی هەڵبژارد. چونکە زوو زوو بەسەرهاتی لەم شێوەیەی بەسەر دەهات. ئیتر ئەویش لەلایەن خۆیەوە بە خەمبارییەوە دەیڕوانییە حاڵی پەرێشانی ئەو خەڵکە. ڕاستە حەزرەتی ئەبوبەکر لەسەردەمی

نەفامیدا دەژیا، بەڵام هەرگیز ژیانێکی نەفامانە نەژیاوە و دوور بووە لەهەموو ڕواڵەتەکانی بت پەرستی و نەفامی.

دوای تەواوبوونی خواردن و ماوەی پشوو، کاروانەکە دووبارە دەستی کردەوە بە ڕۆیشتن. لای ئێوارە جارێکی تر مۆڵیان دایەوە. ئەوەبوو لەو شەوەدا حەزرەتی ئەبوبەکر خەونێکی بینی.

لە خەونەکەیدا مانگ هاتبووە ئامێزی. لەو کاتەدا کە ویستبووی لە باوەشی بگرێت بەخەبەر هاتبوو.

کە ڕۆژ بووەوە، خەونەکەی بۆ هاوڕێکانی گێڕایەوە. بەڵام کەسیان نەیاندەزانی لێکدانەوەی خەونەکە چییە. تا لە کۆتاییدا ناونیشانی ڕاهیبێکیان بۆ هەڵدا. ئەو ڕاهیبە خەڵکی یەمەن بوو، ناوی "یەمیلکا" بوو. کەسێکی دانا و زانا بوو.

لەگەڵ گەیشتنیدا بە یەمەن، دەستبەجێ ڕاهیبەکەی دۆزییەوە. کە خەونەکەی بۆ گێڕایەوە، داوای لێکرد بۆی لێکبداتەوە، ڕاهیبەکەش وتی:

- خەڵکی کوێیت؟

- مەککە.

- چ کارەی؟

- بازرگانم.

ئەم وەڵامانە بزەیان خستە سەر لێوی ڕاهیبەکە. پاش ئەوەی بەوردی چاوی خشاند بە گەنجە خوێنگەرمەکەی بەردەمیدا،

ئینجا خۆی کۆکردەوە و بەدەنگێکی پڕ ئومێدەوە کەوتە قسە:

- ئەو خەونەی تۆ دیوتە، مژدەگەلێکی گەورەی تێدایە.

حەزرەتی ئەبوبەکر بەتاسەوە گوێی بۆ شل کردبوو. ڕاهیبەکە بەردەوام بوو لە وتەکانی:

- ئەو مانگەی کەوا لە ئاسمانەوە دابەزی، ئاماژەیە بۆ دوایین پێغەمبەر. بەم نزیکانە دەردەکەوێت. تۆش دەبیت بە نزیکترین هاوەڵ و یارمەتیدەری.

وتەکانی ڕاهیب کاریگەرییەکی بێ وێنەیان لەسەر حەزرەتی ئەبوبەکر جێهێشت. جا خۆ لەو کاتەدا دەنگوباسی هاتنی دوایین پێغەمبەر ببووە باس و خواسی هەموو کۆڕ و دانیشتنەکان. تەورات و ئینجیلیش چەندین مژدەیان تێدابوو لەوبارەیەوە. بەڵام ئەبوبەکر هەرگیز چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد خۆی ببێتە نزیکترین دۆست و هاوەڵی ئەو پێغەمبەرە.

ئینجا یەمیلکای ڕاهیب وتی:

- لە بەرامبەر ئەم مژدەیەدا، منیش داواکارییەکم لێت هەیە. کاتێك پێی گەیشتیت؛ هەواڵم بۆ بنێرە ئەگەر زیندوو بووم. ئەوا دێمە خزمەتی و بە دیداری شاد دەبم. خۆ ئەگەر لە ژیاندا نەمابووم، ئەوا سەلامی منی پێ بگەیەنە. بە شاهید بە کەوا من لە ئێستاوە باوەڕ بە هەموو ئەو شتانە دەهێنم کە ئەو دەیهێنێت.

ئیتر ئەوەبوو حەزرەتی ئەبوبەکر ماڵئاوایی لە یەمیلکای

ڕاهیب کرد و بەدەم بیرکردنەوە و تێڕامان لە وتەکانی ڕاهیبەکەوە گەڕایەوە بۆ مەککە. لە پاش ئەو ڕووداوەشەوە گرنگی زیاتری دەدا بەو شتانەی کە لە دەوروبەریدا ڕوویان دەدا.

* * *

# دەستبەجێ قبووڵ کردن

ئەو ڕۆژە حەزرەتی ئەبوبەکر لە ماڵەوە بوو. چاوی بڕیبووە دیوارەکە و خەیاڵی ڕۆیشتبوو. هەر بیری لەو مژدەیە دەکردەوە کە بەسەر زاری خەڵکییەوە بوو. زانا مەسیحی و جووەکانیش دەیانوت کە بەو نزیکانە پێغەمبەرێك دێت. ئاخر ئەبوبەکر خۆشی کەسێکی زانا بوو. لەو کتێبانەدا کە خوێندبوونیەوە چەندین مژدەی هاوشێوەی وتەی زاناکانی تێدابوو.

لەناکاو هەستایە سەرپێ و لەماڵ چووە دەر. بەنیاز بوو بەرەو لای حەزرەتی موحەممەدی هاوڕێی بڕوات کە بە "الأمین" ناسرابوو. هۆکاری چوونە لای هاوڕێ گیانی بەگیانییەکەشی کردنەوەی باسوخواسی ئەو بابەتە بوو کە ببووە خولیای سەری. بەدەم ڕێگاوە هەر بیری لەو شتانە دەکردەوە کە بیستبوونی.

کەمێک وردبووەوە بینی وا لە دوورەوە کەسێك بەرەو ڕووی دێت. هەر کە ناسییەوە یەکسەر ڕوخساری گەشایەوە و خۆشی باڵی بەسەردا کێشا. دەی خۆ ئەمە خۆی بوو. موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا! دۆست و هاوڕێی ئازیز و هاوڕێی منداڵی. ئەمە ئەو کەسە خۆشەویست و سەرڕاستە بوو کە ئەگەر پێکەوە بوونایە دەردەڵی خۆی لا دەکرد...

ئەوەندەی پێ نەچوو بەیەکگەیشتن و بە نیگای پڕ لە خۆشەویستی و برایەتییەوە دەیانڕوانییە یەکتری.

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ پرسی:

- ئۆغر بێت، ئەوە بەرەو کوێ دەڕۆیت؟

- ڕاستییەکەی هەر بۆلای تۆ دەهاتم. چەند شتێك هەبوو دەمویست بۆتی باس بکەم. باشە ئەی تۆ بۆ کوێ دەڕۆیشتییت؟

ئەبوبەکری زانا هەر زوو درکی بەوە کرد کە محەمەدی هاوڕێی دەیەوێت شتگەلێکی گرنگی بۆ باس بکات. هەروەك ئەوەش بوو کە چاوەڕوانی دەکرد. ڕاستبێژترینی مرۆڤایەتی بەهێمنی لێوەکانی بزواند:

- من نێردراو و پێغەمبەری خوام. خوای گەورە ڕایسپاردووم بەوەی فەرمانەکانی بە خەڵکی ڕابگەیەنم. هەروەها تۆش بانگهێشت دەکەم بۆلای خوای گەورە. سوێند بە خوا، ئەم بانگەوازەی من حەق و ڕاستییە.

حەزرەتی ئەبوبەکر بەسەرجەمی هەستەکانییەوە گوێی بۆ

هاوڕێ خۆشەویستەکەی گرتبوو. ئای ئەم وتانە چەندە شیرین و جوان بوون! لە کۆتاییدا ئەو مرۆڤەی هەموو جیهان چاوەڕێی بوو و مژدەی هاتنیان دەدا، دەرکەوت.

- ئەی ئەبوبەکر! بانگت دەکەم بۆ بەندایەتی کردنی خوای گەورە. بانگت دەکەم بۆ ئەوەی هاوەڵ و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەیت و جگە لەو، هیچ شتێکی تر نەپەرستیت. هەروەها بانگت دەکەم تا لە سەرخستن و چەسپاندنی پەیامی پەروەردگاردا هاوکار و یارمەتیدەرم بیت!

حەزرەتی ئەبوبەکر پرسی:

- بەڵگەت چییە بۆ ئەمە؟

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ فەرمووی:

- ئەو زانا پیرەی کە لە یەمەن بینیت.

پاشان لەگەڵ زاناکەدا چییان باسکردبوو هەمووی بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر گێڕایەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر بە چاوی پڕ خۆشەویستییەوە دەیڕوانییە ڕوخساری نوورانیی پێغەمبەری خوا. دەتوت چەندین ساڵە لە چاوەڕوانی ئەم ساتەدایە. لەو کاتەدا کە ترپەکانی دڵی بەم مژدە خۆشەوە لەوپەڕی خێراییدا لێیان دەدا، دەستی درێژ کرد و دەستی شانازی مرۆڤایەتی گرت. ئا لەوکاتەدا و بە دەنگێکی پڕ جۆشەوە کە هەڵقوڵاوی ناخی تینووی بوو بە شەربەتاوی ئیمان، چەند وتەیەکی لە زار هاتە دەر کە دەتوت نەخشی سەر بەردن:

- وا من شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە "الله"، موحەمەدیش بەندە و نێردراوی ئەوە.

دڵی ناسکی ئەبوبەکر بەوێنەی باڵندە خەریك بوو باڵی دەگرت. ئەمەش تامی ئەو دڵخۆشییە بوو کە لەوەودوا بە یەکێک لە یەکەمین باوەڕدارانی سەر زەوی هەژمار دەکرا.

* * *



# بانگهێشتی خەڵکی

موسوڵمانان، وەک ئەوەی بڕیاریان لەسەر دابوو، لە ماڵی ئەرقەم کۆبوبوونەوە. ئەو کاتە هێشتا ژمارەیان سی و هەشت کەس بوو. هەموو هاوەڵان بەگشتی و لەپێش هەموشیانەوە حەزرەتی

ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت)، چاویان لەسەر پێغەمبەرمان ﷺ نەدەتروکاند و چاوەڕوانی بیستنی گفتە گەوهەر ئاساکانی بوون. هەمووان زۆر دڵخۆش بوون. چونکە ڕێگای ڕاستیان دۆزیبووەوە و بڕیاریان دابوو کە چیدی توخنی تاوان خراپەکاری نەکەونەوە.

لەوکاتەدا ژمارەی موسوڵمانان بە پەنجەی دەست دەژمێررا و ژیانی مرۆڤایەتیش لە تاوان وخراپەکاریدا گەیشتبووە لوتکە. دەبووایە بەهەر نرخێك بێت ئەم ڕاستییە ئەڵماس ئاسایانەیان بگەیاندایەتە دەست سەرجەمی مرۆڤایەتی. حەزرەتی ئەبوبەکر، تەماشایەکی پێغەمبەری نازدارمانی کرد کە هەمیشە دەم بە بزە بوو و وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا، با هەموو پێکەوە بڕۆینە دەرەوە و باسی ئیسلام بۆ ئەو خەڵکە بکەین. بۆ ئەوەی ئەوانیش تامی دڵخۆشی ئیمان بچەژن.

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بە نیگاکانی کە پڕبوون لە خۆشەویستی، ڕووی کردە حەزرەتی ئەبوبەکر و فەرمووی:

- هێشتا ژمارەمان کەمە.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لەسەر ئەمە پێداگری کرد. هەرچی پێغەمبەری خواش بوو ﷺ پێداگری هاوەڵانی نەدایە دواوە. هەر بۆیە هەموو پێکەوە بەرەو کەعبەی پیرۆز ملی ڕێگەیان گرتە بەر. کاتێك گەیشتنە شوێنی مەبەست، هەر کەسەو چوو لەنێو خزم و کەسوکاری خۆیدا دانیشت و پاشان دەستیان کرد بە باس کردنی ئەو ڕاستییە مرواری ئاسایانەی کە ئادەمیزادیان بەرەو

ئارامی و ئاسوودەیی دەبرد.

هەر لەوێدا حەزرەتی ئەبوبەکر وتارێکی بۆ ئەو خەڵکە بت پەرستە دا و بانگهێشتی کردن بۆ لای ناسینی خوا و پێغەمبەرەکەی. سەروەریشمان ﷺ بۆخۆی لە سووچێکدا دانیشت بوو و تەماشای ئەوی دەکرد.

هەموو ئەو خەڵکە بتپەرستەی لەوکاتەدا لەوێ بوون، ڕوانینە پڕ خەشم و قینەکانی خۆیان بڕیبووە حەزرەتی ئەبوبەکر. بۆیە لە دڵی خۆیاندا دەیان وت: "دە بەسە ئیتر نەبڕایەوە!" ئیتر بەرە بەرە ورتە ورتەکە بوو بە ژاوەژاو و هەبوو دەیووت:

- تۆ تەماشای ئەمانە! وا دیارە لەبیریان چووەتە کە خەڵکی تەنها لەبەر خاتری ئەم خواوەندانە هاتوون بۆ مەککە. ئەگەر بێت و ئێمە لە خواوەندەکانمان پاشگەز ببینەوە و پشتیان تێ بکەین، ئەوا بێگومان هۆزەکانی دەوروبەریشمان دەست بەرداریان دەبن. دەی خۆ ئاشکرایە ئەو کاتەش مەککە پێگەی بازرگانیی خۆی لەدەست دەدات و ئێمەش دەسخەڕۆ دەبین و بێ ئیش و بێ کار، برسی دەکەوین!

بۆیە پاش کەمێک هەموو دڵە پڕ لە ڕق و قینەکان بەجارێک هەستانە سەر پێ و بەرەو موسوڵمانەکان هێرشیان برد و وتیان:

- کەوایە بۆ وەستاوین؟ ئەوە کێیە قسە دەکات، بێدەنگی بکەن.

ئەبوجەهل تینی دایە بەرخۆی پەلاماری سەروەرمان بدات بەڵام هاوەڵان بواریان بەمە نەدا و هەر لەوێدا مەردانە گیانی خۆیان کردە

قەڵغانی پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەوەبوو بێباوەڕان بەدار و بەرد و شەق و زلە و چەندین سوکایەتی تر، بەربوونە گیانی موسوڵمانان. هەتا هێزیان تێدابوو لە هاوەڵانیاندا. بەتایبەت، یەکێک لە بێباوەڕەکان کە ناوی عوتبە بوو، تۆزقاڵێك چییە هەستی مرۆڤایەتی تێدا نەمابوو. ڕێک دەتووت دڕەندەیەکی برسییە و تەنها بەدار لێدان دڵی ئاو ناخواتەوە، بۆیە بەپێڵاوە نووك ئاسنینەکانی کەوتە دەموچاوی حەزرەتی ئەبوبەکر.

حەزرەتی ئەبوبەکر هەموو دەموچاوی ئاوسا بوو. عوتبە هەر بەمەندە وازی نەهێنا، ئەمجارەیان بەهەردوو پێکانی چووە سەر سکی حەزرەتی ئەبوبەکر و لەسەری هەڵدەپەڕی، بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر بەرگەی ئەمەی نەگرت و بوورایەوە.

یەکێك لەوانەی کە بە چاوی ئەبڵەقەوە تەماشای ئەم دیمەنانەی دەکرد، هاواری لێ بەرز بووەوە وتی:

- تەماشا، وابزانم مرد!

- هێی سەیرکەن، کوڕانی تەیم هاتن!

چەند پیاوێك وەك هەورە بروسکە گەیشتنە ناو بێباوەڕان و دەستبەجێ بڵاوەیان پێ کردن. ئەمانە سەر بە هۆزی بەنو تەیم بوون. حەزرەتی ئەبوبەکریش سەر بەم هۆزە بوو. بەڵێ، خزمەکانی حەزرەتی ئەبوبەکر هاتبوون تا لە چنگی ئەم بێباوەڕە دڕندە و بێبەزەییانە ڕزگاری بکەن. هەرچەندە هێشتا موسوڵمان نەبووبوون، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەبوبەکر خزمیان بوو. بۆیە تەنها بە مەبەستی ڕزگارکردنی هاتبوون. ئیتر هەر بە گەیشتنیان حەزرەتی

ئەبوبەکریان لەژێر دەستی عوتبە دەرهێنا. یەکێك لە ناویاندا وتی:

- بووراوەتەوە، دەبێت بێ ئەوەی بیجوڵێنین هەڵی بگرین. خێرا بەتانیەك بهێنن!

زۆری نەخایاند بەتانیەکیان هێنا، حەزرەتی ئەبوبەکریش بۆخۆی بەبێهۆشی تەختی زەوییەکە ببوو. ئەوانیش خستیانە ناو بەتانیەکەوە و بردیانەوە بۆ ماڵەوە. هەموویان بێگومان بوون لەوەی کە زۆرنابات دەمرێت. ئەمانیش ئەمجارە بە توڕەییەوە گەڕانەوە بۆ کەعبە و هەڕەشەیان لە دەست درێژی کاران کرد و وتیان:

- سوێند بێ ئەگەر ئەبوبەکر بمرێت، ئەوا عوتبە بە زیندوویی لە دەستمان دەرناچێت.

بێ باوەڕان حەزرەتی ئەبوبەکریان خستبووە گیانەڵا. ئەو خزمانەشی کە هاتبوون بەدەمیەوە و لەلای بوون، بە نائومێدییەوە چاوەڕوانی هەواڵی مەرگی بوون. حەزرەتی ئەبوبەکر هێندە حاڵی پەرێشان بوو، کە نەك قسەکردن، بگرە نەیدەتوانی لێوەکانیشی بجوڵێنێت. بەڵام خۆشبەختانە دوای ماوەیەکی زۆر چاوەکانی کردەوە. پاش ئەوەی چاوێکی گێڕا بەوانەی لە دەوروبەریدا بوون، بە مەراقەوە پرسی:

- پێغەمبەری خوا چۆنە؟

گشت ئەو کەسانەی لەخۆشی هۆشهاتنەوەی حەزرەتی ئەبوبەکر دڵخۆش ببوون، ڕوویان گۆڕا. دەموچاویان دابەیەکدا و دەستیان کرد بە لۆمەکردنی حەزرەتی ئەبوبەکر:

- تۆ بە بۆنەی ئەوەوە وات لێ بەسەرهات. کەچی هێشتا هەر بیر لە خۆت ناکەیتەوە و خەمی ئەوتە.

خزمێکی تری وتی:

- بەڕاستی حەیفە وا لە خۆت دەکەیت! هەر لە خوتو خۆڕایی خۆت خستە مەترسییەوە. خۆ خەریك بوو بتکوژن. بەڵام پێتا دیارە کە هێشتا دەرست وەرنەگرتووە.

حەزرەتی ئەبوبەکر هیچ گوێی بەم قسانە نەدا. بەڵکو بەردەوام لە حاڵی پێغەمبەری خوای دەپرسی. چونکە پێش ئەوەی ببورێتەوە بینیبووی کە سوکایەتی پێکرابوو.

بۆیە دووبارە پرسییەوە:

- ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ زیندووە؟ چی بەسەر هاتووە؟

ئەو هاوڕێ ئازیزە، پێغەمبەری خوای لە گیانی خۆی بەلاوە گرنگتر بوو. بۆ یە ئامادە بوو لە پێناو سەلامەتی ئەو دا هەزاران ئەبوبەکر بکاتە قوربانی.

* * *



# ڕاستگۆ

لەو کاتەدا کە حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بە کۆڵانەکانی مەککەدا دەگەڕا، بینی وا چەند کەسێك بەپەلە بەرەو ڕووی دێن. شپرزەیی بە دەموچاویاندا دیاربوو. کاتێك تەواو نزیك بوونەوە، خێرا یەکێکیان هاواری کرد و وتی:

- ئەبوبەکر، بیستووتە؟

- ؟

- محەمەدی هاورێت دەڵێت گوایە لەشەوێکدا ڕێگایەکی چل ڕۆژەی بڕیوە.

- !

- گوایە لە مەککەوە چووە بۆ مزگەوتی ئەقسا و لەوێشەوە بەرەو ئاسمانەکان بەرز بووەتەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) تەواو چاوەکانی کردەوە و پرسی:

- ئایا هەر بەڕاستی ئەمانە قسەی ئەون؟

پیاوەکەی بەرامبەری بزە گرتی. لە دڵی خۆیدا بەتەمابوو حەزرەتی ئەبوبەکر ڕەخنە بگرێت و بڵێت "جا شتی وا چۆن دەبێت!؟" بۆیە بە هیواوە وەڵامی دایەوە:

- ئەرێ بە دڵنیاییەوە قسەی ئەون! ڕووداوێکی باوەڕپێنەکراوە، وا نییە؟

حەزرەتی ئەبوبەکر تەماشایەکی پڕ واتای کردن و لە تەسلیمییەتێکی تەواودا ئەم وەڵامەی دانەوە:

- هەرگیز من وەکو ئێوە بیر ناکەمەوە. ئەگەر بەڕاستی ئەمانەی قسەی خۆی بن، ئەوا ڕاستی وتووە. ئایا هەرگیز بیستووتانە تەنانەت بە گاڵتەشەوە درۆبکات؟

بێ باوەڕان تەواو سەریان لێ تێکچووبوو، نەیاندەزانی چی بڵێن. بەڵام یەکێکیان خۆی کۆکردەوە و وتی:

- مەبەستت چییە؟ واتە ئێستا تۆ باوەڕ بەم قسانە دەکەیت؟!

حەزرەتی ئەبوبەکر خۆی گورج کردەوە و وتی:

- بێ هیچ دوودڵییەك!

ئیتر کە وەڵامی چاوەڕوانکراویان دەست نەکەوت، کۆتا هەوڵی خۆیان خستە گەڕ و وتیان:

- بەڵام چۆن شتی وا دەبێت؟ لێرەوە بچیت بۆ قودس، پاشان بۆ ئاسمانەکان... ئینجا بەرلەوەی ڕۆژیش ببێتەوە، گەڕابیتەوە... ئەم قسانە هی ئەوە نین ئەقڵ بینابڕێت! باشە ئەبوبەکر تۆ چۆن باوەڕ بە شتێکی وا دەکەیت؟!

حەزرەتی ئەبوبەکر بێ سێ و دوو وەڵامی دانەوە و وتی:

- نەک هەر تەنها باوەڕ دەکەم! بەڵکو بڕواشم بە گشت ئەو وەحی و سرووشانەش هەیە کە خوای تاک و تەنها لە ڕێی فریشتەکانەوە لە ئاسمانەوە بۆی دەنێرێت. ئەوەی جێی سەرسوڕمانە، حاڵی ئێوەیە؛ باشە هەر ئێوە نەبوون ناوتان لێنا "الأمین" و بەو ناوەوە بانگتان دەکرد؟! کەچی وا ئێستا باوەڕ بە قسەکانیشی ناکەن.

کاتێك بێ باوەڕان نائومێد بوون لەوەی بەدوایدا دەگەڕان، حەزرەتی ئەبوبەکریان جێهێشت و گەڕانەوە. لەڕاستیدا حەزرەتی ئەبوبەکر ڕەفتارێکی وای لە ڕوودا نواندن کە هەرگیز چاوەڕوانیان نەدەکرد.

ئەوانەی شایەتحاڵی ڕووداوەکە بوون، دواتر ڕووداوەکەیان بۆ پێغەمبەرمان گێڕایەوە. پێغەمبەری تاجی سەرمان ﷺ زۆر دڵی بەو هەواڵە خۆش بوو. هەر بۆیە نازناوی "صدیق"ی بە حەزرەتی ئەبوبەکر بەخشی، بە واتای ئەو کەسەی کە بە هەموو شێوەیەك ڕاستی پشتڕاست دەکاتەوە. دوای ئەو ڕۆژە حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) هەر بە ڕاستگۆ بانگدەکرا.

* * *



# ئەی بیلال سەربەستیت!

بێ باوەڕان نەیاندەتوانی بڵاوبوونەوە و گەشەسەندنی ڕۆژ لەدوای ڕۆژی ئیسلام قبووڵ بکەن. هەموو هەوڵێکی خۆیان دەخستە گەڕ بۆ بەرگرتن لە بڵاوبوونەوە و تەشەنە نەکردنی ئیسلام. بۆیە سەرەتا زیاتر کەوتنە ئەشکەنجە و ئازاردانی موسوڵمانە هەژار و بێ

کەسەکان. بەجۆرێک ئەشکەنجەیان دەدان و ستەمیان لێدەکردن، کە تا ئێستا بە بیر و خەیاڵی کەسدا نەهاتوو. هەندێکیان لە حەسیر دەپێچان و بەزیندوویی دەیانسووتاندن، هەندێکی تریشیان برسی و تینوو دەکرد.

لەبەر ئەوەی هۆزەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) ئەویان گرتبووە خۆیان، بۆیە بێ باوەڕان نەیاندەتوانی بەهیچ شێوەیەک نزیکی بکەونەوە. بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر ئەم هەلەی قۆستەوە و بێ ترس بە کۆڵانەکانی مەککە دا دەسوڕایەوە و باسی گەورەیی و دەستەڵاتی خوای بۆ خەڵکی دەکرد.

ڕۆژێك پیاوێك بە ڕاکردن هات و شتێکی چپاند بە گوێی حەزرەتی ئەبوبەکردا. حەزرەتی ئەبوبەکر یەکسەر هەستایە سەر پێ و ئەوەندەی لە توانایدا بوو خێرا ڕایکرد. هەروەک وەك با دەڕۆیشت. تا ئەو کاتەی گەیشت بە قەرەباڵغییەک کە لەسەر ڕێگەکەیدا بوو، ئەم هەر بەردەوام بوو لە ڕاکردن. ئەو خەڵکە لەو بیابانە گەرمەدا قاقایان دەچوو بە ئاسماندا. گەر تەماشات بکردنایە زۆر خۆشحاڵ دیاربوون. لەو کاتەدا دەنگێکی ترسناك باڵی بەسەر پێکەنینەکەیاندا کێشا:

- ئەی بیلال یان ئەوەتا بۆخۆت دەمریت! یاخود واز لە موحەممەد دەهێنیت و لات وعوزا دەپەرستیت!

حەزرەتی بیلالیش (ڕەزای خوای لەسەر بێت) بەو هەموو ئازارە زۆرەوە و بەدەنگێکی کزەوە وەڵامی دەدایەوە و دەیوت:

- خوا یەکە! خوا یەکە!

حەزرەتی ئەبوبەکر لەتاوا خۆی کرد بە ناو قەرەباڵغییەکەدا و چووە پێشەوە. بەڵام بە بینینی دیمەنەکە وشک بوو.

ئەوەتا کۆیلەیەکی حەبەشی لەسەر ئەو لمە گەرمە لەسەر پشت پاڵخراوە و بەردێکی گەورەشیان لەسەر سکی داناوە. ئەم مرۆڤە ڕەش پێستە حەرزەتی بیلالی حەبەشی بوو، کە تازە موسوڵمان ببوو.

حەزرەتی ئەبوبەکر چیدی بەرگەی نەگرت بیلال بەم ئازار و ئەشکەنجەیەوە ببینێت. بۆیە بە تووڕەییەوە تەماشایەکی ئومەییەی کرد و پێی وت:

- چیت لەم داماوە دەوێت؟ بۆ لە خوا ناترسیت؟ باشە تا کەی لەم زەبر و ستەمەت بەردەوام دەبیت؟

ئومەییە هەستایە سەرپێ و ڕووی کردە حەزرەتی ئەبوبەکر. دەموچاوی دابەیەکدا و ئەوەندەی تر ناشرین بوو. ئەمجا وەڵامی دایەوە و وتی:

- هەر تۆ نەبوویت کە ئەوت لەسەر ڕێ لادا؟! کەواتە هەر خۆشت دەبێت لەم حاڵە ڕزگاری بکەیت!

ئەم داواکارییەی ئومەییە هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو. ئومەییە تەواو لە بیلال بێئومێد ببوو و دەیوت هاکا مرد. بۆیە نییەتی هێنابوو بیدات بەسەر حەزرەتی ئەبوبەکردا و پێی بفرۆشێت.

حەزرەتی ئەبوبەکر وتی:

- ئێ باشە. من بەندەیەکم هەیە و هاودینی تۆشە. هەروەها لە بیلالیش بەهێزترە. من ئەو کۆیلەیەت دەدەمێ، تۆش بیلال بە من

بدە.

ئومەییە کەسێك بوو کە هێندەی گەردیلەیەك مرۆڤایەتی لە ناخیدا هەڵنەگرتبوو. بۆیە وەک ئەوەی بیەوێت قەرەباڵغییەکە بە شایەت بگرێت وتی:

- بە مەرجێك ڕازی دەبم کە ژنی بەندەکەشم بدەیتێ.

- باشە، ڕازیم.

- پەلەمەکە هێشتا ماومە، منداڵەکانیشیم دەوێت.

- باشە، بەمەشیان ڕازیم. مەرجی ترت ماوە؟

- ئیتر ڕازی بووم. برۆ با بیلال هەر بۆ خۆت بێت.

حەزرەتی ئەبوبەکر زۆر بەمە دڵخۆش بوو. یەکسەر ڕایکرد بەردەکەی سەر سکی بیلالی لابرد و وتی:

- دەی هەستە بیلال. ئیتر ڕزگارت بوو.

بەم شێوەیە لە قەرەباڵغییەکە دووری خستەوە. پاشان هەر لەگەڵ بیلالدا شەش کۆیلەی تریشی ڕزگار کرد.

* * *



# چاودێری

زەبر و ستەمی بێ باوەڕان تا دەهات لە زیادبووندا بوو. ژیانی موسوڵمانان لە مەککەدا تەواو ئەستەم ببوو. ئازار و ئەشکەنجەکان گەیشتبوونە ئاستێك کە بەرگەگرتن ئاسان نەبوو.

کاتێک حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بە دەنگی

بەرز قورئانی دەخوێند، بێ باوەڕان زۆر ناڕەحەت دەبوون. چونکە کاتێك دەستی بە خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەکرد، نەیدەتوانی بەر بە فرمێسکەکانی بگرێ و بەکوڵ دەگریا. کاتێکیش لەناخی دڵەوە دەیخوێند بەهامن شێوە نوقمی فرمێسکەکانی دەبوو.

سەرەتا ژن و گەنجەکانی هۆزی قورەیش بەسەرسوڕمانەوە تەماشایان دەکرد. هەموویان سەرسام ببوون. بۆیە وردە وردە لەنێو خۆیاندا دەستیان دەکرد بە چپە چپ و دەیانوت:

- بەڕاستی سەیرە، ئەوە ئەم پیاوە چی دەخوێنێتەوە؟

- دەنگیشی زۆر بەسۆزە...

- بڕوانن بڕوانن! وا ئەبوبەکر دەگری!

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) نەک هەر خۆی لە قسەکانیان تێنەگەیاند، بەڵکو هەر هەستیشی پێ نەکردبوون. نوێژێکی درێژی دابەستبوو و بەردەوام قورئانی دەخوێندەوە و فرمێسکی گەشی هەڵدەڕشت. ئەوەندە بەردەوام بوو لە قورئان خوێندن و گریان، تا ئەوەی ئەو ئایەتانەی لە ناخیدا ڕەگیان داکوتابوو، کاریگەری لەسەر گوێگرانیشی کرد. بۆیە ئەوانیش زیاتر لێی نزیك بوونەوە، بە ڕادەیەك کە بۆ بینینی حەزرەتی ئەبوبەکر پاڵیان بە یەکترییەوە دەنا.

بێ باوەڕان ئەم دیمەنەیان بەدڵ نەبوو. بۆیە هاتن حەزرەتی ئەبوبەکریان ئاگادار کردەوە لەوەی کە کاریگەری لەسەر ژن و گەنجەکانیان داناوە. بەڵام ئەو هیچ گوێی بەم قسانە نەدا. بەڵکو هەر بەردەوام بوو لە خوێندنی قورئانی پیرۆز بە دەنگی بەرز و

دەستی دەکرد بە گریان. بێگومان ژن و گەنجەکانیش زیاتر و زیاتر لە حەزرەتی ئەبوبەکر ورد دەبوونەوە... کاتێك بێ باوەڕان بینیان کارەکان بەرەو خراپتر دەڕوات، هەموو یەکیان گرت و لە بەردەم حەزرەتی ئەبوبەکردا کۆ بوونەوە. ئینجا لە وتەکانیاندا کە بۆنی هەڕەشە و گوڕەشەی لێدەهات، نییەتی دڵی خۆیانیان درکاند و وتیان:

- کوڕەکەی ئەبو قوحافە ئاگادار بە! ئیتر بەرگەی کارەکانت ناگرین. گەر لەمەودوا بەردەوام بیت لەوەی بە ئاشکرا پەرستشەکانت ئەنجام بدەیت، ئەوا ئاکامی ئەم کارەت باش نابێت، ئەوە بزانە!

حەزرەتی ئەبوبەکر زۆر بەمە دڵگران بوو. بۆیە یەکسەر ڕای کرد بۆ لای پێغەمبەرمان ﷺ و داواکاری بێباوەڕەکانی بۆ گێڕایەوە:

- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بێ باوەڕان ڕێگریی پەرستشەکانم لێ دەکەن. ئایا گوێ بە هەڕەشەکانیان بدەم؟ تکاتان لێ دەکەم مۆڵەتم بدەن با بڕۆم لە شوێنێك پەرستشەکانم ئەنجام بدەم کە کەس نەبێتە ڕێگر لەبەردەممدا.

بۆیە پێغەمبەری ئازادارمان ﷺ پێی فەرموو مەککە جێ بهێڵێت و ڕێی حەبەشە بگرێتە بەر. چونکە لەوێ دەیتوانی بە ئازادی پەرستشەکانی ئەنجام بدات و کەسیش لەسەر بیر و باوەڕەکەی کێشەی بۆ دروست نەدەکرد.

حەزرەتی ئەبوبەکر بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدات مەککەی بەجێهیشت و بەرەو حەبەشە کەوتە ڕێ. هەتا بڵێی غەمگین بوو. دوورکەوتنەوەی لە مەککە و جێهێشتنی تاقانە دۆستەکەی بە تەنها،

کارێکی ئەستەم و گران بوو. لە ڕێگادا گەیشت بە مۆڵگەی هۆزێك. ئیبنو دەغننەی سەرۆك هۆز هەر کە حەزرەتی ئەبوبەکری بینی، یەکسەر ناسیەوە. بۆیە لێی پرسی:

- بۆکوێ دەڕۆیت ئەبوبەکر؟

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بە خەمبارییەوە ئاوڕی دایەوە بەلای مەککەدا و تەماشایەکی کرد. بۆیە ویستی بەم وشانە زام و خەمە قووڵەکەی ناخی بخاتە سەر زار و وتی:

- نەمتوانی چیتر بەرگەی زەبر و زەنگی خەڵکی مەککە بگرم و ناچار بووم شارەکەم بەجێ بهێڵم. دەچم بۆ شوێنێك بتوانم تێیدا بەئارامی پەرستشەکانم ئەنجام بدەم.

ئیبنو دەغننە موسوڵمان نەبوو، بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکری زۆر خۆشدەویست. بۆیە بە دەنگێکەوە کە متمانە و باوەڕ بەخۆبوونی پێوە دیاربوو بە حەزرەتی ئەبوبەکری وت:

- ئەی ئەبوبەکر. ناکرێت کەسانی وەکو تۆ لە زێد و نیشتمانی خۆیان دەربکرێن. تۆ کەسێک بوویت هەمیشە: یارمەتی هەژارانت داوە و چاودێری خزمەکانت کردووە و بە دەم هاوار و ناخۆشی خەڵکییەوە بوویت و لە میوان پەروەریشدا هەرگیز درێخیت نەکردووە. بگەڕێرەوە بۆ مەککە و لە نیشتیمانی خۆتدا پەرستشەکات ئەنجام بدە. بەڵێن بێت من دەتپارێزم!

بۆیە پێکەوە چوونەوە ناو شار. بێ ئەوەی زۆری بەسەردا بچێت ئیبنو دەغننە ئێوارەیەك دەرگا بە دەرگا چووە ماڵی هەموو

گەورە پیاوانی هۆزی قورەیش. هەمان ئەم قسانەشی بە هەموویان ڕاگەیاند کە دەیوت:

- ئەبوبەکر پیاوێك نییە لە زێد و نیشتمانی خۆی دەربکرێت. باشە چۆن دەوێرن کەسێك لە وڵاتەکەی دەربەدەر بکەن کە هەردەم یارمەتی هەژارانی داوە و چاودێری خزمەکانی کردووە؟ باش ئەوە بزانن کە لەمەودوا ئەبوبەکر لەژێر چاودێری مندایە. هیچ کەس خراپ لەگەڵیدا نەجووڵێتەوە.

خەڵکی مەککە ڕێزی ئەم پیاوەیان لابوو. بۆیە ڕەخنەیان لە داڵدەدانەکەی نەگرت. بەڵام مەرجێکیان دانا و وتیان:

- با قسەی تۆ بێت و ئەبوبەکریش لە مەککەدا بمێنێتەوە. بەڵام تکایە پێی بڵێ با پەرستشەکانی لە ماڵەکەی خۆیدا ئەنجام بدات. با نوێژەکانی لەماڵەوە بکات و لە ژوورەکەشیا چی دەوێت بیخوێنێتەوە. بەڵام نابێت بەهیچ جۆرێک هیچکام لەم کارانە بەئاشکرا ئەنجام بدات. چونکە ئێمە پێی ناڕەحەت دەبین. بەڵێ کاتێك ئەبوبەکر بەئاشکرا پەرستش ئەنجام دەدات، کار دەکاتە سەر ژن و گەنجەکانی ئێمە.

ئیبنو دەغننە دوای ئەوەی گوێی لە قسەکانیان گرت پێی وتن:

- ئەم قسانەتان بە خۆی دەگەیەنم. بەڵام باش ئەوە بزانن ئیتر ئەبوبەکر لەژێر چاودێری مندایە. ئەوەی پەنجەیەکی بۆ بەرێت وەکو وایە ڕووبەڕووی من بووبێتەوە.

پاشان ئیبنو دەغننە چوو بۆلای حەزرەتی ئەبوبەکر و مەرجی

بێباوەڕەکانی پێ ڕاگەیاند. ئیتر ئەوە بوو حەزرەتی ئەبوبەکر گۆشەگیری ماڵەکەی بوو و چیدی نەیدەتوانی بچێت بۆ کەعبە بۆ ئەنجامدانی پەرستشەکانی. بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکر بەرگەی ئەم دوورییەی نەگرت و زۆری نەخایاند لە حەوشەی ماڵەکەیدا مزگەوتێکی بچکۆلانەی دروستکرد. پاشان پەرستەشەکانی خۆی لەم مزگەوتە بچکۆلەیەدا ئەنجام دەدا و وەك جاری جاران قورئانی دەخوێندەوە و بە بەردەوامی دەگریا.

ئیتر ئەو خەڵکانەی دەیانویست بزانن حەزرەتی ئەبوبەکر لە ژوورەوە سەرقاڵی چییە و بۆ گوێگرتن لەو شتانەی بەردەوام دەیخوێندنەوە، ڕۆژانە دەوری مزگەوتەکەیان دەدا، جا ئەوەندەی نەبرد کە خەڵکەکە وەک جاری پێشوو کەوتنەوە ژێر کاریگەریی حەزرەتی ئەبوبەکر. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمجارەیان بێ باوەڕان نەیاندەتوانی دەنگ بکەن. چونکە حەزرەتی ئەبوبەکر لەژێر چاودێری ئیبنو دەغننەدا بوو.

کەس نەیدەتوانی ئازاری پیاوێك بدات کە لەژێر چاودێری کەسێکی تردا بووایە. بۆیە بێ باوەڕان بەهۆی ئەم داب و نەریتەی خۆیانەوە دەست و پێیان بەسترابوو. دواتر ئەوەیان بە باش زانی کە هەواڵ بۆ ئیبنو دەغننە بنێرن و بانگی بکەن بۆ مەککە.

دوای ئەوەی هەواڵەکەی پێگەیشت، ئیبنو دەغننە بەرەو مەککە بەڕێ کەوت. هەر لەگەڵ گەیشتنیدا بێ باوەڕان بارودۆخەکەیان بۆ باس کرد و وتیان:

- ئێمە بەو مەرجە لەگەڵ تۆدا ڕێککەوتین کە ئەبوبەکر لە ماڵەکەی خۆیدا پەرستشەکانی ئەنجام بدات. کەچی پێی لێ

ڕاکێشاوە و هەموو سنورەکانی بەزاندووە. ئەوەتا لە حەوشەکەیدا مزگەوتێکی دروست کردووە و تیایدا بەئاشکرا نوێژ دەکات قورئان دەخوێنێتەوە. وەکو پێشتریش ئاگادارمان کردیتەوە، ئەم کارەی ئەو کاریگەری دەکاتە سەر ژن وگەنجەکانمان.

بێ باوەڕان هێندە تووڕە بوون، ئاگریان دەکردەوە. گەر لە دەستیان بهاتایە ئەوا حەزرەتی ئەبوبەکریان هەلا هەلا دەکرد. بتپەرستی سەرتاپای ژیانی داگیر کردبوون و دڵەکانیانی هاوشێوەی بەرد ڕەق کردبوو. بۆیە بڕیار و نییەتی دڵی خۆیان بۆ ئیبنو دەغننە ئاشکرا کرد و وتیان:

- پێی بڵێ واز لەم کارەی بهێنێت. ئەگەر هاتو قایل بوو بەوەی لە ماڵەکەی خۆیدا پەرستشەکانی ئەنجام بدات، ئەوە باشە. ئەگەر نا، ئەوا دەبێت پێی بڵێیت کە چیدی لە ژێر چاودێری خۆتدا نایهێڵێتەوە و دەستبەرداری دەبیت. بە ڕاستی ئێمە ڕێزمان بۆ تۆ هەیە و نامانەوێت دەست بۆ کەسێک بەرین کە لەژێر چاودێری تۆدا بێت. بەڵام ئەگەر هەروا بەردەوامبێت، ئەوا ئێمە هەرگیز بەمە ڕازی نابین.

ئیبنو دەغننە بێ ئەوەی هیچ بڵێت قوڕەیشییەکانی جێهێشت. ئەمجارە مەککەییەکان زۆر توڕە بوون، بۆیە نەیدەویست ڕووبەڕوویان ببێتەوە. زۆری نەبرد حەزرەتی ئەبوبەکری دۆزییەوە و پێی وت:

- خۆت دەزانیت کە لەژێر چ هەلومەرجێکدا تۆم خستووەتە ژێر چاودێری خۆمەوە. ئیتر یان ئەوەتا وەک ئەوەی لەسەری ڕێککەوتبووین بەردەوام دەبیت، یاخود دەبێت پێیان ڕابگەیەنیت

کە مافی چاودێرییەکەت بۆ گەڕاندوومەتەوە. چونکە نامەوێت گوێم لێبێت عەرەبەکان پێم بڵێن: ئیبنو دەغننە لە بەڵێنەکەی خۆی پەشیمان بووەتەوە.

ئاشکرابوو کە حەزرەتی ئەبوبەکر تەواو بێزار ببوو لەوەی لەژێر چاودێری کەسێکی تردا بێت. هەر بۆیە بە دەنگێکی پڕ متمانەوە وتی:

- فەرموو ئەوە چاودێرییەکەت بۆ خۆت! چاودێریی خوام بەسە.

ئیبنو دەغننە هەر ئەوەندەی گوێی لە قسەکانی حەزرەتی ئەبوبەکر بوو، ڕۆیشت و بە قورەیشییەکانی وت:

- ئەی قورەیشییەکان! ئەوە کوڕی ئەبو قوحافە متمانەکەمی پێ دامەوە. لە ئێستە بەدواوە هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئێوە و ئەودا نییە! چیتان دەوێت بیکەن، من دەست ناخەمە کارتانەوە!

دواتر حەزرەتی ئەبوبەکر ڕۆیشت بەرەو کەعبە. ئەوەبوو یەکێك لە نەفامەکانی قورەیش ئەمەی بە هەل زانی. بۆیە ڕێی پێگرت و زۆر نامرۆڤانە خۆڵی هەڵگرت و کردی بەسەر و چاویدا. حەزرەتی ئەبوبەکر تەواو بەم هەڵسوکەوتە ناڕەحەت بوو، بۆیە ڕووی کردە ئەو خەڵکەی کە سەیری ڕووداوەکەیان دەکرد و پێی وتن:

- خۆ بینیتان ئەم سەرسەرییە چی لێ کردم، وانییە؟

ئەوانیش زۆر بێباکانە وەڵامیان دایەوە و وتیان:

- تۆ خۆت ئەمەت بەسەر خۆتدا هێنا! جا با تۆش وەك ئەو خەڵکە بوویتایە... بۆچی دژایەتیی هۆزەکەت دەکەیت؟

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بە کردار و وەڵامیان زۆر بێتاقەت بوو. هەر لەبەر ئەوە ناخی پاکی بەرگەی ئەو هەموو دڵڕەقی و ڕەفتارە ناشرینانەی نەدەگرت. بەدەم ڕێگاوە ئەم ڕاستییە مرواری ئاسایانەی لە دەم هاتنە دەرەوە:

- خوایەگیان، چەندە بە سەبریت! خوایەگیان، چەندە بە سەبریت! خوایەگیان، چەندە بە سەبریت!

* * *



# مۆڵەتی کۆچ

بەخێرایی لە دەرگا درا. ئەندامانی ماڵ بەتاسەوە دەرگاکەیان کردەوە. بینییان وا ڕووناکییەك ژوورەکەی پڕکرد. بەڵام خوایەگیان خۆ ئەمە ڕووناکی خۆر نەبوو. بەڵێ ئەوە نووری حەزرەتی موحەممەد بوو ﷺ! هەر لەوێدا هەموو چاوەکان جارێکی تر بینابیان

گەشایەوە. حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) خەمی بوو شتێک ڕوویدابێت، حەزرەتی عائیشە و ئەسماش (خوا لێیان ڕازی بێت) پەشۆکابوون.

ئەمە بارودۆخێکی ئاسایی نەبوو. ڕاستە فەخری کائینات هەموو ڕۆژێك سەردانی دەکردن، بەڵام ئەمە یەکەم جار بوو لەم کاتەدا بێتە لایان. لەوەوپێش نازداری مرۆڤایەتی یان بەیانیان یاخود ئێواران دەهاتە لایان، بەڵام ئەمە یەکەم جاری بوو بە قرچەی نیوەڕۆ لە دەرگایان بدات. کەواتە دەبوو مەسەلەیەکی گرنگ لە ئارادابێت. بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بەتاسەوە پرسی:

- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، قەت نەبووە لەم کاتەدا تەشریف بفەرموویت بۆ ماڵمان. پێدەچێت بابەتێکی گرنگ هەبێت...

پێغەمبەری لە دڵان خۆشەویستمان ﷺ بینی وا حەزرەتی عائیشە و حەزرەتی ئەسماش (خوا لێیان ڕازی بێت) لەوێن. بۆیە بە دەنگێکی نزم بە حەزرەتی ئەبوبەکری فەرموو:

- با ئەوان بچنە دەرەوە. دەمەوێت بە نهێنی قسەت لەگەڵدا بکەم.

حەزرەتی ئەبوبەکر بە دەنگێکەوە کە متمانەی بە گوێگر دەبەخشی فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا، دایك و باوکم قوربانت بن. خۆ هەردووکیان کچی خۆمن. تۆ بڵێی کارەکەتان چیبێت؟

- خوای گەورە مۆڵەتی داوم لە مەککە دەرچم و کۆچ بکەم.

حەزرەتی ئەبوبەکر خێرا بە هەیەجانێکی زۆرەوە پرسی:

- پێغەمبەری خوا، ئەی من! ئایا مۆڵەتم هەیە یاوەریت بکەم؟

- منیش هەر بۆ ئەوە هاتووم تا تۆ لەگەڵ خۆمدا بەرم.

فرمێسکەکانی چاوی حەزرەتی ئەبوبەکر چیدی ئۆقرەیان نەگرت و بەخوڕەم داباریین. ماوەیەکی زۆر هەر دەگریا. تا لە کۆتاییدا چاوە پڕ لەفرمێسکەکانی ڕوو کردە پێغەمبەری خوا و فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە چەندین مانگە دوو وشترم تەنها بۆ ڕۆژێکی ئاوا ئامادە کردووە. دانەیەکیان ئێوە بەکاری بهێنن.

پێغەمبەری ئازیزمان قایل نەبوو بێ بەرامبەر سواری وشترەکە ببێت. بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی:

- دایك و باوکم قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا. قەینا، پارەکەی بدە. بەڵام با چی زووتر لێرە بڕۆین!

هەموو ئامادەکارییەکانی کۆچکردن تەواو ببوون. بۆیە لەگەڵ ڕێنیشاندەرێکدا ڕێککەوتن و بڕیاریاندا کە عامری شوان خواردنیان بۆ بهێنێت و لەگەڵ ئەوەشدا هەواڵی ڕووداوەکانی مەککەیان بۆ بگوازێتەوە.

بۆ ڕۆژی پێنج شەممە پێغەمبەری خوا و حەزرەتی ئەبوبەکر لە دەرگای پشتەوەی ماڵەوە چوونە دەرەوە و بەرەو کێوی "ثەور" بەڕێ کەوتن.

حەزرەتی ئەبوبەکر لە ڕێگەدا زۆر خەمی بوو. بەبەردەوامی چاودێری دەوروبەری دەکرد و ئەو ناوەی دەپشکنی. لەوانەبوو لە کاتی دەرچوونیان لە مەککە کەسێك لە دوورەوە بینیبێتنی. بۆیە دەبوو لە زەمینەیەکی ئاوادا ئامادەی ئەگەرێکی لەوجۆرە و هەر ڕووداوێکی تری چاوەڕواننەکراو بووایە کە بەسەر پێغەمبەری خوادا بهاتایە.

کاتێك پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ هەستی بەم هەڵسوکەوتەی کرد لێی پرسی:

- ئەی ئەبوبەکر، بۆچی ماوەیەك لە پێشمەوە و ماوەیەك لە دوامەوە دەڕۆیت؟

حەزرەتی ئەبوبەکریش بەچاوێکی پڕ لە خۆشەویستییەوە لە پێغەمبەرمانی ڕوانی و فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا، هەندێك جار وا هەست دەکەم بەدوامانەوەبن. بۆیە لەو کاتانەدا لە دواوە دەڕۆم. هەندێك جاریش وا هەست دەکەم کە لە کەناری ڕێگەکەدا بۆسەیان بۆ دانابین، هەر بۆیە لەو کاتانەشدا لە پێشەوە دەڕۆم.

پێغەمبەری ئازیزمان زەردەخەنەیەکی کرد و بە دەنگێکی پڕ لە خۆشەویستییەوە فەرموویان:

- دەتەوێت لە کاتی هەر مەترسییەکدا تۆ لە جێی من بەربکەویت، وانییە؟

حەزرەتی ئەبوبەکر بێ دوودڵی وەڵامی دایەوە و فەرمووی:

- بەڵێ، سوێند بەو خوایەی کە تۆی بەحەق ناردووە، نامەوێت هیچ جۆرە زیانێکت پێ بگات. خۆم دەخەمە بەر هەر مەترسییەک کە دووچارت ببێتەوە.

دوای ئەو ماوەیە لە ڕۆیشتن و ناڕەحەتییەکانی کۆچکردن، ئەشکەوتەکەیان لێ دەرکەوت. پاشان بەوریاییەوە بەرەو ئەشکەوتەکە سەرکەوتن. کاتێك گەیشتنە بەردەمی ئەشکەوتەکە، حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) دیسان خەمی لێ نیشت. بۆیە گیانفیدایانە ڕووی کردە سەروەرمان و وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، با لە پێشدا من بڕۆمە ژوورەوە. خوا دەزانێت چی لێیە. دەکرێت ئەم ئەشکەوتە لانەی ئاژەڵە کێوییەکان بێت. یان کونی مار و مێرووی تێدا بێت. نامەوێت هیچ شتێک ئازارتان بدات.

بۆیە چووە ناو ئەشکەوتەکە و کەوتە ئامادەکردنی. هات دانە دانە کونەکانی دۆزییەوە، ئینجا کراسەکەی بەری دڕاند و یەکە یەکەی کونەکانی پێ گرت. ئیتر پاش ئەوەی کە لە پاکوخاوێنی و سەلامەتی ئەشکەوتەکە دڵنیابوو، پێغەمبەری نازداری بانگهێشتی ناو ئەشکەوتەکە کرد. پێغەمبەرمان ﷺ بەزەحمەت لە دەرەچەی بچووکی ئەشکەوتەکەوە چووە ناوەوە و لە شوێنێکدا دانیشت.

پێغەمبەرمان و حەزرەتی ئەبوبەکر لە ئەشکەوتەکەدا سەرقاڵی یادکردنەوەی خوای گەورە بوون. بەم شێوەیە بەردەوام بوون تا نزیکی دەمەو ئێوارە. پاشان گوێیان لە حیلەی ئەسپ و کۆمەڵە پیاوێك بوو کە بەدەنگی بەرز قسەیان دەکرد؛ وا دیار بوو ئەمانە بەدوای

پێغەمبەری خوا و حەزرەتی ئەبوبەکردا دەگەڕان. دەنگی سەرۆکی کۆمەڵەکەش ئومەییە بوو. دەیووت:

- بست بە بستی مەککە گەڕاین، بەڵام نەماندۆزینەوە. سوێند بە هوبەل گەر چووبێتیشن بەناخی زەویدا، هەر دەبێت بیاندۆزمەوە!

بێباوەڕەکان شوێن پێهەڵگرێکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو. بۆیە دوای ئەوەی ئەو ناوەی بەوردی پشکنی، وتی:

- شوێن پێکان بەرەو ڕووی ئەو ئەشکەوتە دەڕۆن.

ئەبو جەهل لەتاوا وتی:

- کەوایە بۆچی وەستاوین؟ دەی با بچین قۆڵبەستیان بکەین!

هەموویان بەجارێ بە کێوەکەدا هەڵگەڕان و پاش ماوەیەکی کەم گەشتنە بەردەم ئەشکەوتەکە.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لەخەمدا دەتلایەوە. هەناسەی خۆی گرتبوو و چاوی بڕیبووە دەرگای ئەشکەوتەکە. بەچپە فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا. وا بڕوا ئەم پیاوانە دەستگیرمان دەکەن! بڕوانە، ئەگەر بێت و یەکێکیان بنوشتێتەوە و سەیری لای قاچی بکات، ئەوا دەمانبینێت! سوێند بە خوا خەمی خۆمم نییە، تەنها خەمی تۆمە. پێغەمبەری لە دڵان ئازیزمان ئەوەی پێی بڵێی خەم بە دەموچاویەوە نەدەبینرا؛ هەتا بڵێی ئارام دیار بوو. بە حەزرەتی ئەبوبەکری فەرموو:

- مەترسە. خوامان لەگەڵە.



لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنەوایی حەزرەتی ئەبووبەکری کرد، بێباوەڕەکان دیسان دەستیان کردەوە بە قسەکردن و ئومەییە بەتوڕەییەوە هاواری دەکرد بەسەر شوێن پێ هەڵگرەکەدا و دەیووت:

- باشە ئەو تۆڕی جاڵجاڵۆکەیە نابینیت بە دەمی ئەشکەوتەکەوە؟ ئەی ئەو هێلانە کۆترە؟ بێگومان ئەگەر لێرەبوونایە ئەم تۆڕە ئاوا

نەدەمایەوە. لە خۆڕا ئێمەت هیلاك كرد.

پاشان سواری ئەسپەكانیان بوون و بەخێرایی لەو ناوە دووركەوتنەوە. بەم شێوەیە و بەفەرمانی یەزدان تۆڕی جاڵجاڵۆكە و هێلانەی كۆترەكان بوونە پارێزەری ئەو دوو ڕێبوارە پیرۆزە. ئەمە موعجیزەیەكی ڕوون و ئاشكرای خواوەندی میهرەبان بوو. خوای گەورە بەو شێوەیە باوەڕدارانی دەپاراست.

* * *



# ڕێنیشاندەری ڕاستەقینە

پێغەمبەری سەروەرمان و حەزرەتی ئەبوبەکر بۆ بەیانی ڕۆژی دووشەممە، لەگەڵ ڕێنیشاندەرەکەیاندا ئەشکەوتەکەیان جێهێشت. کاتێك هەنگاوی کۆچیان ڕووەو مەدینە هەڵدەنا، بەحەسرەتەوە بۆ شاری مەککەیان دەڕوانی. لەو کاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) گوێبیستی ئەم وتە شیرینانە بوو کە لە زاری

موبارەکی سەروەمانەوە دەهاتنە دەرەوە:

- ئەی مەککە، سوێند بەخوا تۆ پڕ خێرترین و خۆشەویستترینی ئەو شوێنانەی کە خوای گەورە بەدی هێناوە! هیچ زێد و نیشتیمانێك نییە لەلام لە تۆ جوانتر و خۆشەویستتر بێت. ئەگەر گەلەکەم دەریان نەکردمایە و لەتۆیان دوور نەخستمایەتەوە، ئەوا هەرگیز لێت دوور نەدەکەوتمەوە.

کات نزیکی نیوەڕۆ ببووەوە و خۆریش ڕێك بەسەر سەریانەوە بوو. لەتاو تینی گەرمای خۆری بیابان، چیدی نەیانتوانی لە ڕۆیشتن بەردەوام بن. بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا و لە دوورەوە کۆمەڵە تاشە بەردێکی بەدی کرد و فەرمووی:

- ئا ئەویا سێبەرە!

یەکسەر بەرەو ئەو شوێنە ڕای کرد. بینی تەنها بەشی یەک کەس سێبەر مابووەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر بە دەست هەرچی دڕک و خۆڵ و بەردی ژێر سێبەرەکە هەبوو، هەمووی پاککردەوە. پاشان کراسەکەی بەری داکەند و لە زەویدا ڕای خست، ئینجا بانگی پێغەمبەری ئازیز و لە دڵان خۆشەویستی کرد و فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموون لێرەدا کەمێك ڕاکشێن و بحەوێنەوە. دواتر دەکەوینەوە ڕێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سوپاسگوزاری ئەم خۆبەخشییەی حەزرەتی ئەبوبەکر بوو. دواتر لە سێبەرەکەدا ڕاکشا و کەمێک

حەوایەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر چوو چاوێک بەوناوەدا بخشێنێت، بۆ ئەوەی بزانێت ئایا دوایان کەوتوون یاخود نا. لە کاتی گەڕانەکەیدا بە شوانێکی گەنج گەیشت کە لەو ناوە خەریکی لەوەڕاندنی مەڕەکانی بوو. حەزرەتی ئەبوبەکریش لە شوانەکەی پرسی:

- مەڕت هەیە شیری هەبێت؟

- بەڵێ.

- دەی کەوایە، دەکرێ هەندێ شیرمان بۆ بدۆشیت؟

- بۆ نا؟ بەدڵنیاییەوە، لە خزمەتتدام.

ئینجا مەڕێکی گرت و هێنای و شیرەکەی بۆ دۆشینە جامێکی ئاو خواردنەوەوە. حەزرەتی ئەبوبەکر جامەکەی لێوەرگرت و شیرەکەی کردە قاپێکەوە. پاشان سوپاسی شوانەکەی کرد و هاتەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ. سەروەریشمان پاش ئەوەی بەخەبەر هات، شیرەکەی خواردەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر پرسی:

- ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر بڕۆین؟

سەروەری دڵانیشمان لە شوێنی خۆی هەستایەوە و پاشان پێکەوە کەل و پەلەکانیان لە وشترەکان بارکرد و بەڕێ کەوتن.

* * *

# ئەسپەکەی سوراقە

قورەیشییە بێباوەڕەکان سەد وشتریان دەکردە خەڵاتی ئەو کەسەی پێغەمبەری خوا و حەزرەتی ئەبوبەکر دەست بەسەر بکات. سوراقە کە شوێن پێهەڵگرێکی شارەزا بوو، هەواڵی پێگەیشتبوو کە چوار کەس بە دوو وشترەوە بینراوون. بۆیە یەکسەر بێ ئەوەی کات بەفیرۆ بدات ئەسپەکەی بەرەو ئەو شوێنە تاودا و توانی لەماوەیەکی کەمدا بیاندۆزێتەو. سوراقە هەر ئەوەندی لە دوورەوە دوو وشترەکەی لێ دیارکەوت، غاری بە ئەسپەکەی دا و تەپوتۆزێکی زۆری لەو ناوە هەستاند، ئیتر هەر بەم شێوەیە بەردەوام بوو تا لێیان نزیک بووەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێك بینی وا لەدوورەوە ئەسپسوارێک بەرەو ڕوویان دێت، دڵی کەوتە پەلەپەل و فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا، وا یەکێك بەرەو ڕوومان دێت!

هەرچەندە ئەسپ سوارەکە خەریك بوو پێیان دەگەیشتەوە.

کەچی سەروەرمان هەر خۆیشی تێنەگەیاند و بەوپەڕی متمانە و بڕوا بە خوای گەورەوە، بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن. جارێکی تر حەزرەتی ئەبوبەکر بەپەلە پێغەمبەری خوای ئاگادار کردەوە:

- ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو پیاوە خەریکە پێمان دەگاتەوە!

- مەترسە، خوامان لەگەڵە.

بەڵام پیاوەکە بەتەواوەتی نزیك بووەوە. هەر ئەوەندەی پێنج تا دە مەترێک لە نێوانیاندا مابوو. حەزرەتی ئەبوبەکر هەر زوو تێگەیشتبوو لەوەی ئەم پیاوە دەیەوێت زیانێك بە پێغەمبەرمان بگەیەنێت، بۆیە دەستی کرد بە گریان و فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە ئەو کابرایە پێمان گەیشتەوە.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی کرد حەزرەتی ئەبوبەکر دەگری، وەستا و لێی پرسی:

- بۆچی دەگریت؟

ئەویش بە دڵێکی سووتاوەوە وەڵامی دایەوە و فەرمووی:

- سوێند بە خوا بۆ خۆم ناگریم. دایك و باوکم بەقوربانت بن، من بۆ تۆ دەگریم.

ئینجا پێغەمبەری نازدارمان ﷺ سەیرێکی پیاوەکەی کرد. بۆی دەرکەوت ئەوە سوراقەیە وا دوایان کەوتووە، چونکە دیاربوو لەبەر خاتری خەڵاتەکە کەوتبووە ڕێ.

بە ئەسپەکەیەوە دای بە سەریاندا و هاواری کرد:

- ئەوە گرتمن.

ڕێك لەو كاتەدا دەنگی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بیسترا كە دەیفەرموو:

- خوایە گیان، لە خراپەكارییەكانی ئەم پیاوە بمانپارێزە!

ڕێک لەگەڵ نزاكەی سەروەرماندا قاچی ئەسپەكەی سوراقە تا سكی لە لمەكەدا چەقی. حەزرەتی ئەبوبەكر واقی وڕما بوو. سوراقە كەوتە خوارەوە و هەوڵی هەستانەوەی دەدا. ئیتر هەر ئەوەندەی خۆی كۆكردەوە، ویستی سواری ئەسپەكەی ببێتەوە و جارێكی تریش پەلاماریان بداتەوە. بەڵام دیسان قاچی ئەسپەكەی لە لمەكەدا چەقی. سوراقە تەواو شڵەژابوو و نەیدەزانی چیبكات. بۆیە وتی:

- دەزانم، ئەمانەی وا بەسەرم دێن بەهۆی تۆوەیە. ئەگەر بێت و ڕزگارم بكەیت، ئەوا وازتان لێدێنم و بۆخۆتان بڕۆن.

بۆیە سەروەرمان داوای لە خوای گەورە كرد تا سوراقە ڕزگار بكات.

سوراقەش كاتێك سواری ئەسپەكەی بووەوە و خەریك بوو بڕوات، وتی:

- لەو پیشەوە كۆمەڵە شوانێكی خۆمی لێیە. پێیان بڵێن با هەرچی مەڕ و وشتریان پێیە بیدەن بە ئێوە. لە مەدینە پێویستتان دەبێت.

پێغەمبەرمان ﷺ زەردەخەنەیەكی بە ڕوودا نواند و نزای خێری بۆ كرد و فەرمووی:

- ئێمە پێویستمان پێی نییە.

دوای ئەوەی سوراقە ڕۆیشت و لێیان دووركەوتەوە، ئەمانیش درێژەیان بە ڕێگەكەیان دا و دووبارە بەرەو مەدینە كەوتنەوە ڕێ. لە كۆتاییدا ڕێگەی كاكی بەكاكی و چۆڵی بیابان كۆتایی پێ هات. ئەوەبوو كەمە كەمە بەخەڵك دەگەیشتن. لەبەر ئەوەی حەزرەتی ئەبوبەكر زوو زوو لەوناوەوە هاتوچۆی دەكرد، هەموو خەڵكەكەی دەناسی. بۆیە بە هەركێ بگەیشتنایە لێیان دەپرسی:

- ئەبوبەكر، ئەو پیاوە كێیە لەگەڵتدا؟

حەزرەتی ئەبوبەكریش بێ دوودڵی دەیوت:

- ڕێنیشاندەرمە.

حەزرەتی ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێت) ڕاستی دەوت. چونكە پێغەمبەری نازدارمان ﷺ لەوەدا كە سەرجەم مرۆڤایەتی بانگ دەكرد بۆ سەر ڕێی ڕاست، ڕێنیشاندەرێكی ڕاستەقینە بوو.

* * *



# مەدینە

خەڵکی مەدینە پێشوازییەکی بێوێنەیان لە پێغەمبەری خوا و حەزرەتی ئەبوبەکر کرد و بانگهێشتیان دەکردن بۆ ماڵەکانیان. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە پێیان وترا "ئەنصار" بە واتای "یارمەتیدەر".

بە میوانەکانیشیان وترا "موهاجیر" بەواتای "کۆچبەر" دێت.

هاوەڵێك بەناوی خاریجە کە خەڵکی مەدینە بوو، میواندارییەکی کەم وێنەی لە حەزرەتی ئەبوبەکر کرد. ئەم هاوەڵە بەڕێزە هەتا بڵێی کەسێکی ڕەوشت جوان و هەڵبژاردە بوو، کە هەمیشە حەزی بە یارمەتی دان دەکرد. حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لەو ڕۆژە بەدواوە لەماڵی خاریجەدا مایەوە. دواتریش کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی برایەتی نێوان ئەنصار و موهاجیرەکانی ڕاگەیاند، حەزرەتی ئەبوبەکری کرد بە برای خاریجە کە لە ماڵەکەیدا دەمایەوە. بەم شێوەیە دۆستایەتی نێوان حەزرەتی ئەبوبەکر و خاریجە زیاتر پەرەی سەند.

لەم ماوەیەدا موسوڵمانەکان بڕیاریاندا کە مزگەوتێک دروست بکەن. بەمەش لەمەودوا دەیانتوانی پەرستشەکانیان بەکۆمەڵ و لە یەک شوێندا ئەنجام بدەن. هەرچی موسوڵمانانی مەدینە بوو ئاواتەخواز بوون مزگەوتەکە بکەوێتە زەوییەکەیانەوە و ئەو شادمانییە بەدەست بهێنن. ئیتر ئەوەبوو لە کۆتاییدا گونجاوترین زەوی دەستنیشان کرا کە بۆ مزگەوت دەستی دەدا. ئەم زەوییە موڵکی دوو منداڵی هەتیو بوو، دەبووایە پێش دەست کردن بە کارەکان، ڕەزامەندی ئەم منداڵانە وەربگیرێت. بۆیە دوای ئەوەی ئاگادارکرانەوە منداڵەکان وتیان:

- ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە ئەم پارچە زەوییە دەکەین بەدیاری ئێوە. بۆیە هەرچۆنێک پێتان خۆشە بەکاری بهێنن.

پێغەمبەری نازدارمان ﷺ ئەم داوایەی قبوڵ نەکرد و فەرمووی

کە دەبێت نرخی راستەقینەی زەوییەکە چەندبێت، ئەوەندە پارە وەربگرن...

بەڵام کاتێك بیریان لەوە دەکردەوە کە چۆن ئەو برە پارەیە دابین بکەن، حەزرەتی ئەبوبەکرفەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا، کە لە مەککەوە هاتین پێنج هەزار درهەمم لەگەڵ خۆم هێنا. ئەگەر رێگەم بدەن، دەمەوێت من پارەی ئەم زەوییە بدەم.

دوای ئەوەی حەزرەتی ئەبوبەکر پارەکەی دا، دەستیان کرد بە بنیاتنانی مزگەوتەکە. حەزرەتی ئەبوبەکریش شان بەشانی پێغەمبەری خوا ﷺ کاری دەکرد. خشتی هەڵدەگرت و قوڕگەچی دەگرتەوە.

*



# مژدەی بەهەشت

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەوە دانیشتبوو. حەزرەتی ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێبێت) هاتبوو پێغەمبەری ئازیز و هاوڕێ و هاودەمی خۆشەویستی ببینێت. حەزرەتی ئەبوبەکر لە دەرگای دەرەوە چاوەڕێی کرد و مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی خواست.

پاشان سەروەرمان بە یەکێک لە هاوەڵانی فەرموو کە بزانێت ئەوە کێیە هاتووە. ئەو هاوەڵە بەرێزەش بەدەستی ئاماژەی بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر کرد و فەرمووی:

- ئەبوبەکرە. مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی دەوێت.

پێغەمبەریشمان فەرمووی:

- با بێتە ژوورەوە و مژدەی بەهەشتیشی بدەرێ.

ئەو هاوەڵە بەرێزە بەزەردەخەنەوە بە حەزرەتی ئەبوبەکری فەرموو:

- ئەی ئەبوبەکر، پێغەمبەری خوا مژدەی بەهەشتت دەداتێ!

حەزرەتی ئەبوبەکر بەم هەواڵە ئێجگار دڵخۆش بوو. چونکە بە بیستنی ئەم هەواڵە بووە یەکێک لە بەختەوەرترین مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەوی. لەو کاتەشدا کە بەرەو ڕووی پێغەمبەری خوا دەرۆیشت، بەردەوام لەسەر ئەو بەخششەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، سوپاس و ستایشی پەروەردگاری دەکرد.

* * *



# پێشبڕکێی چاکە

کاتێك هەواڵ هات کە ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتینی بەمەبەستی پەلاماردانی حیجاز، سوپایەکی زۆری کۆکردووەتەوە؛ موسوڵمانانیش دەستبەجێ کەوتنە خۆ ئامادەکردن. سەروەرمان بۆ ئامادەکردنی سوپاکە داوای یارمەتی لە هاوەڵان کرد. حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) هەموو سەروەت و سامانەکی خۆی بژارد. پاشان

چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەویش لێی پرسی:

- ئەی عومەر، چیت هێناوە؟

حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا نیوەی سامانەکەمم هێناوە.

پێغەمبەری نازداریش لەپای ئەم قسەیە، پرسی:

- ئەی باشە چیت بۆ منداڵەکانت بەجێ هێشتووە؟

حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- ئەوەندەی بۆ ئێرەم هێناوە، ئەوەندەشم بۆ ئەوان جێ هێشتووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەم قسەیە زۆر دڵخۆش بوو.

ئەوەندەی پێنەچوو حەزرەتی ئەبوبەکریش دەرکەوت. حەزرەتی عومەر لە دڵی خۆیدا دەیوت: "ئەم جارەیان لە پێشبڕکێی چاکەدا پێشی ئەبوبەکرم داوەتەوە."

پێغەمبەری خوا پرسی:

- ئەی ئەبوبەکر، چیت هێناوە بۆ سوپاکە؟

ئەویش وەڵامی دایەوە:

- هەرچیم هەیە و نیمە، لە پێناوی خوادا دەیبەخشم.

ئینجا پێغەمبەری خوا پرسی:

- ئەی باشە بۆ خێزانەکەت چیت جێ هێشتووە؟

حەزرەتی ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە و فەرمووی:

- خۆشەویستی و ڕازی بوونی خوا و پێغەمبەرەکەیم بۆ جێهێشتوون.

حەزرەتی عومەر و ئەوانەش کە لەوێ ئامادە بوون جارێکی تر تێگەیشتن کە هیچ کەس ناتوانێت لە پێشبڕکێی چاکەدا پێشی حەزرەتی ئەبوبەکر بداتەوە.

* * *



# برسێتی

شەوێکیان حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) زۆر برسی دەبێت و ئەم برسێتییەشی تەنگی پێ هەڵدەچنێت. بەڵێ، ئەم هاوەڵە بەڕێزەی کە هەموو سەروەت و سامانەکەی لە پێناو سەرخستنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا خەرجکردبوو، وا ئێستا لەتە خورمایەک لە ماڵیدا نییە بۆ ئەوەی کەمێک برسێتییەکەی بڕەوێنێتەوە. بۆیە

پاش ماوەیەك بیرکردنەوە هەر بەبرسێتی لەماڵ چووە دەر و بەرەو مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا کەوتە ڕێ. لەو کاتەی شەودا کۆڵانەکانی مەدینە چۆڵ بوون و کەسیشیان پێوە نەبوو. بەڵام ئەوەندەی نەبرد لە ڕێگە لەگەڵ پێغەمبەری نازدارماندا بەیەک گەیشتن. ئەو دوو هاوڕێ گیانی بەگیانییەی کە هەمیشە هاودەمی یەکدی بوون، وا ئێستا بەم درەنگانەی شەویش بەرامبەر یەک وەستاون و بەسەرسامییەوە تەماشای یەکتری دەکەن. بۆیە پێغەمبەری ئازیزمان لێی پرسی:

- ئەی ئەبوبەکر چی تۆی بەم نیوەشەوە هێناوەتە دەرەوە؟

- برسێتی... باوك و دایکم بە قوربانت بن. ئەی تۆ بۆ لە ماڵ هاتوویتە دەر؟

- منیش هەر بە هەمان هۆکار...

بۆیە ویستیان لە شوێنێکدا دابنیشن، بەڵام ئەوەندەی نەبرد کەسێکی تریش بەرەو ڕوویان هات. ئەو کەسەش هاوەڵی پایە بەرز حەزرەتی عومەر بوو (ڕەزای خوای لێبێت). ئەویش هاوشێوەی سەروەرمان و حەزرەتی ئەبوبەکر برسێتی لەماڵ هێنابوویە دەرەوە. کاتێك دانیشتبوون بیریان لەوە دەکردەوە چی بکەن، پێغەمبەری خوا فەرمووی:

- هەستن با بڕۆین بۆلای ئەبولهەیثەم. بەم شێوەیە هەرسێکیان پێکەوە کەوتنە ڕێ.

ئەو ڕۆژە بێدەنگی باڵی کێشابوو بەسەر ماڵی ئەبولهەیثەمدا.

ئەندامانی خێزان خەریك بوو دەخەوتن. کوڕە بچووکەکەی ئەبولهەیثەم گوێی لێبوو کە لە دەرگا دەدرا. بەدوایدا دەنگێك هات:

- ئەبولهەیثەم!

منداڵەکە لە جێگاکەی هەستایەوە و بانگی باوکی کرد و وتی:

- بابە گیان، هەستە وا حەزرەتی عومەر لە بەردەرگایە. بانگی تۆ دەکات.

ئەبولهەیثەم وتی:

- بنوو کوڕم، بنوو. هیچ نییە گوێت زرەنگاوەتەوە. حەزرەتی عومەر لەم کاتەدا چ کارێکی بە ئێمەیە.

منداڵەکە نەخەوت. بە وردی گوێی بۆ ئەو دەنگە ڕاگرت کە لەدەرەوە دەهات. دووبارە دەنگێکی تر بیسترا:

- ئەبولهەیثەم!

ئەمجارەیان منداڵەکە باوکی ڕاوەشاند و وتی:

- بابە، هەستە ئەمە دەنگی حەزرەتی ئەبوبەکرە. نزیکترین هاوڕێی پێغەمبەری خوا وا لە دەرگا دەدات!

ئەبولهەیثەم کەمێک وەستا و بیری کردەوە. پاشان لە دڵی خۆیدا وتی لەم کاتەدا خەڵکی ناچنە دەرەوە. بۆیە دووبارە وەك جاری پێشوو وتی:

- بنوو کوڕم، بنوو. باشە ئەبوبەکر بۆ لەم کاتەدا بێت بۆماڵی ئێمە؟ کوڕم بە هەڵە گوێت لێ بووە.

منداڵەکە دیسان نەخەوت. گوێی بۆ ئەو ئاخاوتنانە هەڵخست کە لە دەرەوە دەکران. ڕێك لەم کاتەدا دەنگێك بیسترا کە ئارامی بە دڵەکان دەبەخشی:

- ئەبولهەیثەم!

منداڵەکە کاتێك ئەم دەنگەی بیست، جۆشا. لە جێگەکەی ڕاست بووەوە و بەرەو لای دەرگاکە ڕای کرد. لەلایەکی تریشەوە بەخۆشییەوە باوکی بانگ دەکرد:

- بابەگیان هەستە! پێغەمبەری خوا هاتووە بۆ ماڵمان.

کە منداڵەکە دەرگاکەی کردەوە پێغەمبەری خوا و حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەری بینی. پاش ئەوەی بە چاوە درەوشاوەکانییەوە تەماشای هەموویانیکرد، وتی:

- بەخێربێی ئەی پێغەمبەری خوا!

لەم کاتەدا ئەبولهەیثەمیش بە ڕاکردن خۆی گەیاندە بەردەرگا. کە میوانەکانی بەردەرگای بینی، شڵەژا و سەری لێ شێوا:

- ئەمە چ شەرەفێکی گەورەیە ئەی پێغەمبەری خوا! فەرموون وەرنە ژوورەوە.

زۆری پێ نەچوو ئەبولهەیثەم لە باخچەکەی خۆی چەندین جۆر خورمای لێ کردەوە و یەکسەر یەکێك لە ئاژەڵەکانی سەربڕی و خواردنی بۆ میوانەکانی ئامادە کرد. بەڕاستی خۆشییەکی زۆر گەورە بوو بۆ ئەم کە برسێتی ئەم سێ مرۆڤە گەورەیەی ڕەواندەوە کە هەموو ماڵ و سامانیان لە مەککە جێ هێشتبوو.

* * *



# پارووی حەرام

ئێوارەیەکیان حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) زۆری برسی بوو. ئیتر لەم کاتەدا خزمەتکارەکەی هات و هەندێک خواردنی بۆ هێنا.

پاشان پێی وت:

- ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا، ئەوە هەندێك خواردنم بۆ هێناویت، فەرموون ئامادەیە.

حەزرەتی ئەبوبەکر دەستی کرد بە نان خواردن و کاتێك خەریک بوو تەواو دەبوو، کۆتا پارووی خستە دەمییەوە و قوتیدا. بەڵام هەستی بە سەرسامیی خزمەتکارەکەی کرد و پێی وت:

- خێرە؟ بۆچی ئاوا سەیرم دەکەیت؟

خزمەتکارەکەی بە سەرسوورمانەوە وتی:

- هەرکاتێك شتێکم بۆت هێنابیت، لێت دەپرسیم کە لە کوێوە هێناومە. بەڵام ئەم جارە بێ ئەوەی بپرسیت خواردت.

دوای ئەوەی حەزرەتی ئەبوبەکر کۆتا پارووی قوتدا وتی:

- بەڕاستی ئەم ئێوارەیە زۆر برسیم بوو. لەوانەیە هەر لەبەر ئەوە نەمپرسی بێت. باشە ئێستە پێم بڵێ بزانم، ئەم خواردنانەت لەکوێوە هێنابوو؟

خزمەتکارەکەی دەستەکانی گوشی و وتی:

- خۆت دەزانیت، پێش ئەوەی موسوڵمان ببم، نوشتە وشتی وام دەنووسی. خێزانێك نوشتەیەکیان پێ نوسیبووم. بەڵام ئەو کاتە پارەکەیان نەدابوو، ئەمڕۆ دام بەلای ماڵیاندا، بینیم وا خەریکی ئاهەنگ گێڕانن. بۆیە منیش خێرا ڕۆیشتم قەرزەکەم بیر خستنەوە، ئەوانیش پێیان دام...

خزمەتکارەکە بێ ئەوەی هەست بە هەڵەکەی بکات بەردەام بوو لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە. حەزرەتی ئەبوبەکریش حەوت

ڕەنگی گۆڕی. خزمەتکارەکەی پرسی:

- منیش بەو پارەیە ئەم خواردنانەم کڕی. چۆن بوو؟ تامیت بە دڵ بوو؟

حەزرەتی ئەبوبەکر توڕە ببوو. بەشڵەژانەوە هاواری کرد:

- ئەی هاوار، خۆ خەریك بوو لەناوم بەریت.

بۆیە پەنجەی کرد بە قوڕگیدا و دەیویست بەزۆر خۆی بڕشێنێتەوە. بەڵام هەرچەند خەریك بوو، نەڕشایەوە. خزمەتکارەکە بە سەرسامی سەیری دەکرد. کاتێك زانی دەیەوێت خۆی بڕشێنێتەوە وتی:

- ئاو بخۆرەوە. تەنها بە خواردنەوەی ئاوی زۆر دەڕشێیتەوە!

حەزرەتی ئەبوبەکر پەرداخ لە دوای پەرداخ ئاوی خواردەوە. دیسان پەنجەی کردەوە بە قوڕگیدا. لە کۆتاییدا توانی خۆی بڕشێنێتەوە و چی لە گەدەیدا بوو، هەمووی هێنایەوە. ئینجا "ئاهـ" ێکی قوڵی هەڵکێشا.

خزمەتکارەکەی پرسی:

- خوا چاکت بۆ بکات. ئەم هەموو ناڕەحەتییەت تەنها بۆ ئەوە بوو تا خواردنەکانی ناو گەدەت بهێنیتەوە؟ جا ئەمە چ زیانێکی بۆ تۆ هەبوو؟

لە کاتێکدا حەزرەتی ئەبوبەکر دەست و دەموچاوی پاك دەکردەوە وەڵامی دایەوە و وتی:

- ئەگەر لەگەڵ ئەم پاروانەدا گیانیشم دەرچووایە، دیسان هەر

هەڵم دەهێنایەوە!

-؟!

- چونکە ڕۆژێکیان گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو: "ئەو جەستەیەی بە حەرام بەخێو کرابێت تەنها ئاگر پاکی دەکاتەوە." خزمەتکارەکە چاوەڕێی ئەوە بوو حەزرەتی ئەبوبەکر لێی تووڕە ببێت. بەڵام ئەوە ڕووی نەدا. حەزرەتی ئەبوبەکر دەیزانی کە ئەو بە نیەتێکی خراپ ئەمەی نەکردبوو. بۆیە بۆ ئەوەی زیاتر ئاگادار بێت ئامۆژگاری کرد.

* * *



# سەردانی نەخۆش

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵاندا قسەی دەکرد. چاوێکی بە دەوروبەردا گێڕا و دواتر پرسی:

- کێ ئەمڕۆ لە ناوتاندا بەڕۆژوو بوو؟

هاوەڵان سەیری یەکترییان کرد. ڕێك لەو کاتەدا کە لە دڵی خۆیاندا دەیانوت لەوانەیە کەس بەڕۆژوو نەبوو بێت، گوێیان لە دەنگی حەزرەتی ئەبوبەکر بوو (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی:

- ئەمڕۆ من بەڕۆژوو بووم ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەرمان ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد و پاشان دووەم پرسیاری کرد:

- باشە، ئەی ئەمڕۆ کێ لە ئێوە چووە بۆ سەردانی نەخۆش؟

دیسان حەزرەتی ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە:

- من ئەمڕۆ سەردانی نەخۆشێکم کرد ئەی پێغەمبەری خوا!

سەروەرمان پرسیارێکی تری کرد:

- کەس هەیە ئەمڕۆ بەشداری لە مەراسیمی بەخاك سپاردنی کەسێکدا کردبێت؟

- من ئەمڕۆ بەشداری مەراسیمی جەنازەیەکم کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

کاتێك حەزرەتی ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە کە ئەمڕۆ بەشداری کردووە، دڵخۆشیی سەروەرمان لە ڕوخساریدا دەخوێندرایەوە.

- باشە کەس هەیە لە ناوتاندا ئەمڕۆ شتێکی بە هەژارێك دابێت و تێری کردبێت؟

دیسان حەزرەتی ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە:

- من ئەمڕۆ هەژارێکم تێرکرد.

پێغەمبەرمان ﷺ بە خۆشەویستییەوە تەماشای هاوڕێکەی کرد و ئەم مژدەیەی پێدا:

- بێ گومان ئەو کەسەی ئەم هەموو جوانییە لە ڕۆژێکدا کۆبکاتەوە، دەچێتە بەهەشتەوە.

* * *

# دەمەقاڵە

حەزرەتی ئەبوبەکر لەگەڵ حەزرەتی عومەردا دەمە قاڵەیەکی بچووکیان بوو. لە ئەنجامدا حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لە حەزرەتی ئەبوبەکر توڕەبوو، پاشان پشتی تێ کرد و چووەوە بۆ ماڵەوە. کاتێکیش حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بۆ داوای لێبووردن چوو بە دوایدا، حەزرەتی عومەر دەرگاکەی بەتوندی بە ڕوودا داخست. هەر بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە ڕای کرد بۆ لای سەروەرمان.

پێغەمبەرمان هەر لەهاتنەکەیەوە تێگەیشت کە شتێك ڕووی داوە. بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر بە خێرایی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە:

- ئەی پێغەمبەری خوا، لەگەڵ عومەردا دەمەقاڵەمان بوو. وابزانم دڵیم ئێشاند. بۆداوای لێبوردن بەدوایدا ڕۆیشتم بەڵام لێی

نەبووریم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

- خوا لێت ببورێت ئەی ئەبوبەکر.

پاش ماوەیەکی کەم حەزرەتی عومەر دەرکەوت. دیاربوو بەخێراییی دەهات. بیری لەوە کردبووەوە کە دڵی حەزرەتی ئەبوبەکری شکاندووە و پەشیمان بووبووەوە.

کاتێك بینی وا پێغەمبەرمان برۆی لێکناوە و تەماشای دەکات، ترسی لێ نیشت. حەزرەتی ئەبوبەکر کە هەستی بە بارودۆخەکە کرد هاتە ناوەوە و فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا من تاوانبارم، من عومەرم تورە کرد.

پێغەمبەرمان بە تورەییەوە بە حەزرەتی عومەری فەرموو:

- نزیکی هاورێکەم مەکەون! نزیکی هاورێکەم مەکەون! کاتێك من مرۆڤەکانم بۆلای خوا بانگهێشت دەکرد، ئێوە هەمووتان بە درۆتان دەخستمەوە. بەڵام ئەبوبەکر بێ دوودڵی لەگەڵمدا بوو.

* * *



# هەموو کەسێک دەیچێژێت

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لە مزگەوت گوێی بۆ وتەکانی پێغەمبەری ئازدارمان ﷺ گرتبوو. پێغەمبەری خوا دەیفەرموو:

- ئەی خەڵکینە! سوێند بەخوا وا ئێستا من لەسەر حەوزی

کەوسەرم. ئەوە بزانن کە خوا بە بەندەیەکی وت: "ئەگەر دەتەوێت دنیات دەدەمێ." بەڵام ئەو ئاخیرەتی هەڵبژارد.

حەزرەتی ئەبوبەکر بەم قسانە تەزوو بە لەشیدا هات و بەگریانەوە فەرمووی:

- دایك و باوکم بەقوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا! باوکمان و دایکمان و خۆمان و هەموو ماڵ و منالّمان دەکەین بەقوربانت.

هاوەڵان لەم قسانە تێنەگەیشتن. باشە بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر ئەم قسانەی کرد؟ بەڵام هاوەڵان لەدواییدا هۆکاری ئەم قسانە تێگەیشتن.

ئەو بەندەیەی کە لەسەر حەوزی کەوسەر دنیایان پێ بەخشی، بەڵام ئەو ئەو ئاخیرەتی هەڵبژارد، پێغەمبەری خوا خۆی بوو. حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) هەر لەسەرەتاوە لەمە تێگەیشتبوو. کەواتە سەروەرمان فەرمانبەریی دنیای تەواو کردبوو و دەگەڕایەوە بەرەو لای پەروەردگاری هەردوو جیهان.

لەڕاستیشدا هەر وابوو. چونکە سەروەرمان پاش ماوەیەکی کەم چاوەکانی لێك نا و گیانی پاکی سپارد.

لە ڕۆژی وەفاتی سەروەرماندا موسوڵمانان نەیان دەزانی چییان بەسەر هاتووە. چونکە تا ئەو ڕۆژە بیریان لە کۆچی دوایی پێغەمبەرمان نەکردبووەوە.

لەو کاتەدا حەزرەتی عومەر شمشێرەکەی دەرهێنا و بە هەموو هێزییەوە هاواری کرد:

- ئەوەی بڵێت "پێغەمبەری خوا مردووە!" ملی دەپەڕێنم.

بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) ڕۆیشتە ژوورەوە. پێغەمبەری خۆشەویستمان لە پارچە قوماشێکی یەمەنییەوە ئاڵێندرابوو. حەزرەتی ئەبوبەکر بۆ دوا جار تەماشای ڕوخساری نوورانی پێغەمبەرمانی کرد و بەدەم گریانەوە فەرمووی:

- ئەی پێغەمبەری خوا! کە لە ژیاندا بویت جوان بوویت، ئێستاش کە کۆچت کردووە هەر جوانیت! دایک و باوکم بە قوربانت بن! وەڵڵاهی خوای گەورە دوو جار تۆ نامرێنێ. تۆ ئەو مردنەت چەشت کە لەسەرت بوو.

لەم کاتەدا لە دەرەوە دەنگی حەزرەتی عومەر دەهات کە دیوت:

- وەڵڵاهی پێغەمبەر نەمردووە! پێغەمبەری خوا نەمردووە!

حەزرەتی ئەبوبەکر بە ئارامی هەستایەوە. بە هێواشی ڕۆیشتە دەرەوە. تەماشایەکی موسوڵمانانی کرد. ئینجا ڕوویکردە حەزرەتی عومەر و فەرمووی:

- دانیشە ئەی عومەر!

بەڵام لەو کاتەدا حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئاگای لەخۆی نەبوو. تەنانەت گوێیشی لە وتەکانی حەزرەتی ئەبوبەکر نەبوو. حەزرەتی ئەبوبەکر ڕووی کردە موسوڵمانەکانی ئەوێ و فەرمووی:

- ئەی خەڵکینە! کێ ئیمانی بە موحەممەد هێناوە، با بزانێت کە ئەو مردووە. هەر کێش خوای گەورە دەپەرستێت، ئەوا با بزانێت کە خوای گەورە زیندووە و هەرگیز نامرێت!

حەزرەتی عومەر خەریک بوو دەهاتەوە سەر خۆی، بەڵام هێزی لەبەر بڕابوو. ئینجا حەزرەتی ئەبوبەکر وتەکانی بە ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز کۆتایی پێ هێنا کە ئەمە واتاکەی بوو:

"موحەمەد تەنها پێغەمبەرێکە. لە پێش ئەویشەوە پێغەمبەر هاتوون و ڕۆیشتوون. ئێستا ئەگەر ئەو بمرێت یان بکوژرێت ئایا ئێوە دەگەڕێنەوە سەر شێوازەکەی پێشووتان؟ هەرکەس وا بکات، با بزانێت کە هیچ زیانێك بە خوا ناگات. خوا پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە."

حەزرەتی عومەر هەر کە ئەم ئایەتەی بیست، یەکسەر کەوتە سەر زەوی و لەهۆش خۆی چوو. کە هۆشی هاتەوە ئارام بووەوە.

ئەوانەی لەوێ بوون وەك ئەوە وابوو کە یەکەم جاریان بێت ئەم ئایەتەیان بەرگوێ کەوتبێت. بە دڵنیاییەوە ئەو ئایەتەی کە دەفەرمووێت: "هەموو نەفسێک تامی مردن دەکات." پێغەمبەری ئێمەشی دەگرتەوە.





# مووچەی مانگانە

ڕۆژێکیان حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) کە تازە ببووە جێنشینی موسوڵمانان لە ماڵ چووە دەر، لە ڕێگا بە حەزرەتی عومەر گەیشت و سەلامیان لە یەکتری کرد. حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) پرسی:

- ئەی ئەمیری باوەڕداران، خێرە، ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟

حەزرەتی ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە:

- بۆ بازاڕ.

- چ کارێکت بە بازاڕ هەیە؟

- کەل و پەل دەکڕم و دەیانفرۆشمەوە. ئەگەر پارەم دەست نەکەوێت ماڵ و منداڵەکەم بە چی بەخێو بکەم؟

حەزرەتی عومەر بەم وتانەی ئەمیری باوەڕداران زۆر سەرسام بوو. باشە چۆن دەبێت سەرۆکی دەوڵەتێکی گەورە و گران لە خەمی بژێوی ژیانیدا بێت؟ بۆیە یەکسەر کەوتە خۆ و پێکەوە چوون بۆلای ئەبو عوبەیدە. حەزرەتی عومەر بارودۆخەکەی بۆ ئەویش باس کرد و فەرمووی:

- ئەی ئەبو عوبەیدە. با ئەبوبەکر تەنها بە کارەکانی دەوڵەتەوە خەریك بێت و خەمی بژێوی ژیانی نەبێت. با مووچەیەکی مانگانەی بۆ ببڕینەوە، کە بتوانێت خێزانەکەی پێ بەخێو بکات.

ئەبو عوبەیدە ڕازی بوو. بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی:

- خوا چاکتان بۆ بکات. ئەم مانگانەیە بە من حەڵاڵ نابێت!

پێداگیرییان کرد. پێیان وت کە ئەمە بۆ ڕێکوپێك بەڕێوە چوونی کارەکانی دەوڵەت، پێویستە. هەرچەندە حەزرەتی ئەبوبەکر پێشی خۆش نەبوو، بەڵام ناچار بوو ڕازی بێت. لەو ڕۆژە بەدواوە حەزرەتی ئەبوبەکر مانگانەیەکی وەردەگرت کە تەنها سکی خێزانەکەیی پێ تێر دەکرد.

* * *



# خاکی بوون

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێك بە کۆڵانەکاندا دەگەڕا، دەنگێك هاتە بەر گوێی کە دەیوت:

- جاران ئەبوبەکر لە کارەکانماندا یارمەتی دەداین. ئیتر بووە بە خەلیفە، باوەڕ ناکەم لەمەودوا یارمەتیمان بدات.

حەزرەتی ئەبوبەکر ڕووی کردە ئەو کچەی کە قسەکەی کرد و فەرمووی:

- خەم مەخۆ کچم. کوڕەکەی ئەبو قوحافە هەرگیز ناگۆڕێت. من هەر وەك جاران، بەردەوام دەبم لە یارمەتی دانتان. دیسان هەرکاتێك ویستتان مەڕەکانتان بۆ دەدۆشم.

بێگومان بەڵێنەکەی خۆی بردەسەر و ئەوەی کە وتی جێ بەجێی کرد. زوو زوو دەڕۆیشت و یارمەتی ئەو کچەی دەدا لەکارەکانیدا. تەنها بەمەشەوە نەوەستا، بەڵکو گەڕا و ئەو کەسانەی دیاری کرد کە پێداویستییەکیان هەبوو. ئیتر ئەوەندەی لە دەستی دەهات یارمەتی دەدان.

جارێکی تریش دیسان بە بیری یارمەتی دانی خەڵکییەوە لەماڵ چووە دەر. لە ڕێگا لەبەر خۆیەوە دەیوت: "خۆزگە ئەوەندە هەبوو دەبووم بمتوانیایە هەموو هەژارەکان تێر بکەم."

پاشان ئەوەندەی نەبرد بە کەلاوەیەك گەیشت. ویستی بزانێت کەس لەم خانووە کۆنەدا دەژی یان نا. بۆیە کاتێك لە دەرگاکەی دا، دەنگی پیرەژنێك لە ژوورەوە هات:

- فەرموو، دەرگا کراوەیە!

حەزرەتی ئەبوبەکر بە ئاکارێکی زۆر جوان دەرگاکەی کردەوە و بە تاسەوە سەیرێکی ژورەوەی کرد. بینی وا ژنێکی پیر لە سوچێکی ژوورەکەدا دانیشتووە. ژنەکە وتی:

- من نابینام. چیت دەوێت؟

حەزرەتی ئەبوبەکر بە بارودۆخی ئەم پیرەژنە زۆر دڵگران بوو. کاتێك زانی هیچ کەسێکی نییە فەرمووی:

- ئەوە ئیتر لەمەودوا هەموو بەیانییەك زوو دێم پێداویستییەکانت بۆ دابین دەکەم.

لەو ڕۆژە بەدواوە ئەمیری موسوڵمانان، حەزرەتی ئەبوبەکر دەستی کرد بە دابین کردنی هەموو پێداویستییەکانی ژنە پیرەکە.

* * *



# سوپا

پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات سوپایەکی ئامادە کردبوو. ئوسامەشی کردبوو بە سەرکردەی ئەم سوپایە. ئەوکاتە ئوسامە (ڕەزای خوای لێبێت) هێشتا زۆر گەنج بوو و تازە بەتازە تەمەنی هەرزەکاری تێپەڕاندبوو. کاتێك ئەم سوپایە خەریك بوو جوڵە بکات، پێغەمبەری خوا کۆچی دوایی کرد. بەڵام دوای وەفاتی

سەروەرمان، ئوسامە سوپاکەی وەستاند.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) هەر کە بوو بە جێنشین، یەکسەر فەرمانی کرد سوپاکە بەڕێبکەوێت. بەڵام لەوانەبوو مەدینەش پێویستی بەو سوپایە هەبێت. چونکە پێدەچوو هەندێك لە هۆزەکان وەفاتی پێغەمبەرمان بە هەل بزانن و پەلاماری مەدینە بدەن، بۆیە حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ڕایەکی جیاوازی هەبوو و فەرمووی:

- خەلیفەی موسڵمانان، ئەی ئەگەر سوپاکە لە مەدینە بمێنێتەوە...

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لەسەر بڕیارەکەی سوور بوو، فەرمووی:

- بەخوا ئەگەر بزانم سەگ و گورگ بەسەرمدا دەڕۆن، هەرگیز سوپاکەی پێغەمبەری خوا ناوەستێنم. چونکە پێغەمبەرمان خۆی ئەم سوپایەی ئامادە کردووە. بۆیە سوپاکە دەڕوات بۆ ئەو شوێنەی ئەو دیاری کردبوو!

هەندێك کەسی ناو سوپاکە ئەوەیان پێ قبووڵ نەدەکرا کەسێکی گەنج ببێت بە سەرکردەیان. بە ڕای ئەوان، پێویست بوو کەسێکی بەتەمەنتر و بە ئەزموونتر سەرکردایەتی سوپاکە بکات. ئەم قسانە بەگوێی حەزرەتی عومەر گەیشتەوە. حەزرەتی عومەر ڕاستەوخۆ چوو بۆلای حەزرەتی ئەبوبەکر و فەرمووی:

- ئەی پێشەوای باوەڕداران. هەندێکیان سەرکردەیەکی بەتەمەنتریان

دەوێت.

حەزرەتی ئەبوبەکر لە جێگەکەی خۆی هەستایەوە. بە حەزرەتی عومەری فەرموو:

- تۆ دەڵێیت چی ئەی کوڕی خەتاب. ئایا من ئوسامەم کردووە بە سەرکردەی سوپاکە؟ ئەی پێغەمبەری خۆشەویستمان بەدەستەکانی خۆی ئەوی نەکرد بەسەرکردەی سوپاکە؟ لە کاتێکدا بابەتەکە ئاوا بێت، چۆن داوام لێ دەکەیت یەکێکی تر لە شوێنی ئەو دابنێم!

ئینجا حەزرەتی عومەر لێی تێگەیشت و لایەنی حەزرەتی ئەبوبەکری گرت. سوپاکە بە سەرکردایەتی حەرزەتی ئوسامە کەوتە جووڵە. حەزرەتی ئەبوبەکر بۆ بەڕێ کردنی سوپاکە لەگەڵ سەربازەکاندا ڕۆیشت.

ئوسامە و هاوڕێکانی بەسواری ئەسپەوە بوون. بۆیە دڵی بەوە ڕازی نەدەبوو سەرۆکی دەوڵەت لەپاڵییەوە بەپێ بڕوات. بۆیە ویستی لە ئەسپەکەی دابەزێت. بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکر نەیهێشت دابەزێت. بۆیە ئەمجارە فەرمانی کرد ئەسپێك بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر بهێنن. حەزرەتی ئەبوبەکر ئەمەشی ڕەت کردەوە و فەرمووی:

- ڕێگە بدەن با قاچەکانم لەڕێی خوادا کەمێك تۆزاوی ببێت.

دوای ماوەیەك ڕێ کردن، حەزرەتی ئەبوبەکر ڕووی کردە ئوسامە و پرسی:

- ڕێگە دەدەیت عومەر لەگەڵمدا لە مەدینە بمێنێتەوە؟

ئوسامە نەیدەزانی چی بڵێت. چونکە حەزرەتی ئەبوبەکر کەسێك

بوو لەشوێنی باوکیدا بوو. سەرەڕای ئەوەش سەرۆکی دەوڵەت بوو. کەوابوو لە جیاتی مۆڵەت وەرگرتن بۆ مانەوەی حەزرەتی عومەر ئەوەندە بەس بووکە بڵێت: "با عومەر لەگەڵمدا بمێنێتەوە." بەڵام وا مۆڵەت لە سەرکردەی سوپا دەخوازێت.

ئەم بارودۆخە زۆر کاری لە سەربازەکانیش کرد. بەم شێوەیە ئەو بێ متمانەییە ڕەوییەوە کە هەندێکیان بەرامبەر حەزرەتی ئوسامە هەیانبوو. حەزرەتی ئوسامەش مۆڵەتی دا حەزرەتی عومەر لە مەدینەدا بمێنێتەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر وتارێکی بۆ سوپاکە دا. ئامۆژگارییەکانی ڕێك ئەو کارانە بوون کە دەبووایە هەموو موسوڵمانێك پێیان هەستێت:

- سووکایەتی بە کەس مەکەن! خراپە بەرامبەر کەس مەنوێنن! منداڵ و پیر و ئافرەت مەکوژن! درەختی بەردار مەبڕنەوە! بۆ خواردن نەبێت، بۆ هیچ مەبەستێکی تر ئاژەڵ سەر مەبڕن. ئەگەر گەشتن بە کەسێك کە لەسەر دینێکی تر بوو، بەهیچ شێوەیەك زیانی پێ مەگەیەنن!

بەم ئامۆژگارییانە سەربازەکانی ئاگادارکردەوە و پێی وتن: "خوا یارمەتی دەرتان بێت." و ماڵئاوایی لێکردن.





# قورئانی پیرۆز

هەمووان حەزرەتی ئەبوبەکریان خۆش دەویست. هیچ کەس سکاڵای لەسەری نەبوو. زۆر بەباشی دەوڵەتی بەڕێوە دەبرد. هەروەها سەرجەمی ئەو پشێوییانەشی چارەسەر کرد کە لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خواوە هاتنە ئاراوە و بەو جۆرە ئارامی گەڕاندەوە بۆ نێو موسوڵمانان.

لە ماوەیەکی کەمدا سوپای موسوڵمانان بە هەر چوار لای

دنیادا بڵاو بوونەوە و چەندین شوێن فەتح کران، هەر بۆیە ئاینی پیرۆزی ئیسلام تەشەنەی کرد و بە پانتاییەکی بەرفراواندا لە بڵاو بوونەوە و گەشەسەندن بەردەوام بوو. بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان لەم فەتح کردنانەدا شەهید بوون و گیانیان بەخت کرد. زۆرێك لەمانەش ئەو کەسانە بوون کە سەرجەمی قورئانی پیرۆزیان لەبەر بوو.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) بە شەهید بوونی ئەو کەسانەی کە هەموو قورئانیان لەبەر بوو، خەمێکی زۆری لێ نیشت. بۆیە چووە بەردەم حەزرەتی ئەبوبەکر و فەرمووی:

- زۆرێك لەوانەی قورئانیان لەبەر بوو لەجەنگەکاندا شەهید بوون. هەروەها ژمارەی ئەوانەش کە قورئانیان لەبەرە ڕۆژ بە ڕۆژ کەم دەکات.

حەزرەتی ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێبێت) هەستی بەم بارودۆخە کردبوو، بۆیە پرسی:

- کەوایە بیر لەچی دەکەیتەوە؟

- با هەموو ئەوانە کۆبکەینەوە کە قورئانیان لەبەرە، پاشان لەژێر چاودێریی ئەوانە و کەسانی تریشدا قورئان کۆبکەینەوە و بیکەین بە کتێبێك.

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵ ئەم ڕایەدا نەبوو، وتی:

- پەنا دەگرم لە کردنی کارێك کە پێغەمبەری خوا نەیکردووە.

حەزرەتی عومەر پێداگری کرد و سوودەکانی ئەم کارەی باس کرد. لە کۆتاییدا حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) ڕازی بوو. یەکسەر حافیزان بانگکران و یەك بەیەکی سورەتەکان نوسرانەوە. ئایەتەکانی قورئان ئیتر هەمووی لە شێوەی کتێبێکدا لە بەرگێکدا کۆکرایەوە.

* * *

# ڕۆژی بەیەک گەیشتنەوە

حەزرەتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لەتەمەنی شەست و سێ ساڵیدا بوو. واتە هەمان ئەو تەمەنەی کە تیایدا پێغەمبەری خوا کۆچی دوایی کرد. ماوەی دوو ساڵی ڕێك بوو کە ئەرکی جێنشینی و بەڕێوەبردنی دەوڵەتی گرتبووە دەست. جودایی و دووری پێغەمبەری خوا، حەزرەتی ئەبوبەکری زۆر خەمبار کردبوو. سات بە ساتی ژیانی تامی دووریی پێغەمبەری خوای دەکرد. بۆیە بەتاسەوە چاوەڕێی ڕۆژی ویساڵی حەبیبی هەمیشە لە دڵانی دەکرد. هەموو ئەمانە و سەرباری ئەمانەش فەرمانبەریی سەرۆکایەتی وڵات نەخۆشیان خست. کۆتا ساتەکانی ژیانی بەسەر دەبرد. کە نەخۆشییەکەی تاوی بۆ هێنا، بوورایەوە. حەزرەتی عائیشە، بەسەر باوکیەوە دەگریا. حەزرەتی ئەبوبەکر زۆری پێ نەچوو هاتەوە هۆش خۆی، یەکسەر لە کچەکەی پرسی:

- عائیشە، پێغەمبەری خوا چ ڕۆژێك وەفاتی کرد؟

حەزرەتی عائیشە لەنێو فرمێسکەکانیەوە توانی وەڵام بداتەوە:

- ڕۆژی دوو شەممە...

- ئەی ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟

- دوو شەممەیە...

حەزرەتی ئەبوبەکر بەهیوای ئەوەی کە لەگەڵ پێغەمبەرماندا لە هەمان تەمەن و لە هەمان ڕۆژدا وەفات بکات، دوعای کرد و وتی:

- خوایە گیان، ئەمڕۆ ڕاسپاردەکەت ببەرەوە.

دواتر سەیری حەزرەتی عائیشەی کرد و فەرمووی:

- ئەم جلانەی بەرم بشۆن. هەروەک چۆن پێغەمبەری خواتان کفن کرد، منیش ئاوا لە سێ کراس بپێچن و بەو شێوەیە بمخەنە ناو گۆڕەوە.

حەزرەتی عائیشە بە زۆر قسەی بۆ دەکرا، فەرمووی:

- بەڵام ئەو جلانە کۆنن...

حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی:

- قەیناکا. زیندووان لە مردووان زیاتر پێویستیان بە جلی تازەیە. خۆ کفنی مردووەکان لە گۆڕدا هەر دەڕزێت.

ئینجا چاوەکانی بڕییە بنمیچەکە و وەسیەتی بۆ کچەکەی کرد و فەرمووی:

- سوپاس بۆ خوا، لەو کاتەوەی کراوم بە فەرمانڕەوای موسوڵمانان، تەنها فلسێکیانم نەخواردووە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەو بەندەیە و ئەو وشترەی کە ئاو دەهێنێت وە ئەم قوماشە قەدیفەیەش هی دەوڵەتن. هەمووی بگێڕنەوە.

حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) بەدەم گریانەوە ئەم داواکارییانەی باوکی هێنایە جێ.

هەروەها کەمێك پێش وەفاتی، هاوەڵە پێشەنگەکانی بانگکرد و ڕاو بۆچونی ئەوانی دەربارەی حەزرەتی عومەر پرسی. بەڕای هەموویان کەسێکی باش بوو. بۆیە حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی:

- عومەری کوڕی خەتتاب لەشوێنی خۆم وەك جێنشین دیاری دەکەم. گوێی لێ بگرن و پەیڕەوی بکەن.

هاوەڵان بێ سێ و دوو ئەم داوایەیان قبووڵ کرد.

ئینجا حەزرەتی ئەبوبەکر بە خوا و پێغەمبەرەکەی شاد بووەوە. لە دوای خۆیشی تەنها وشترێکی شیردەر و خزمەتکارێکی بە میراتی جێ هێشت.

خێزانەکەی جەنازەکەی شۆرد و جێنشینی نوێی موسوڵمانان، کە حەزرەتی عومەر بوو، نوێژی مردووی لەسەر کرد. لەکۆتاییشدا ئەم هاوەڵە پایەبەرزە لە تەنیشت خۆشەویستترین و نزیکترین هاوەڵییەوە کە پێغەمبەری خوا بوو نێژرا. هەر وەك چۆن لەژیاندا شان بەشانی یەکتری بوون، لە گۆڕیشدا هەر بەتەنیشتی یەکترییەوە بوون.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێك لەسەر وەسیەتی

حەزرەتی ئەبوبەکر کرا بە سەرۆکی دەوڵەت، گۆزەیەکیان بۆ هێنا. حەزرەتی عومەر بە سەرسوڕماوی پرسی:

- ئەوە چییە؟

- ئەوە زیادەی مووچەی مانگانەکەی حەزرەتی ئەبوبەکرە. وەسیێتی کردبوو بیدەینە دەستی تۆ.

حەزرەتی عومەر گۆزەکەی بەتاڵ کرد. کاتێك ئەو پارەیەی بینی لە زەویەکەدا بڵاو بووەوە، نەیتوانی ڕێ بە فرمێسکەکانی بگرێت و فەرمووی:

- ئەی ئەبوبەکر، ڕەحمەتی خوات لێبێت! نموونەیەکی زۆر گرانت بەجێهێشتووە بۆ ئەوانەی لەدوای خۆتەوە دێن.

لە منداڵییەوە تا گەنجێتی، لە گەنجێتیشییەوە تا پیری هەر بەجوانی ژیا. شەست و سێ ساڵ تەمەنی بە کاری چاك ڕازاندەوە. خوا و پێغەمبەرەکەی لەو ڕازی بوون، ئەویش لە خوا و پێغەمبەرەکەی... بەم شێوەیە شەرەفی مەزنترین مرۆڤی دوای پێغەمبەری بەدەست هێنا.

ئەم وتانەی کە پێغەمبەری خوا لەبارەی ئەوەوە فەرمووبووی، تا ڕۆژی دوایی لەبیر ناکرێت:

- هیچ کەس نەماوە کە لە بەرامبەر چاکەکانیدا پاداشتی نەدەینەوە، جگە لە ئەبوبەکر! ئەو چاکەی وای هەیە، کە خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا پاداشتی دەداتەوە!

* * *

# حەزرەتی
# ئەبوبەکر
## ڕەزای خوای لێبێت

حەزرەتی ئەبوبەکر یەمیلکای ڕاهیبی دۆزییەوە و خەونەکەی بۆ گێڕایەوە. ئەویش چەند پرسیارێکی ئاڕاستە کرد و بەدەنگێکی پڕ ئومێدەوە پێی وت:

ئەو خەونەی تۆ دیوتە، مژدەگەلێکی گەورەی تێدایە. بەم نزیکانە پێغەمبەرێک دەردەکەوێت. تۆش دەبیت بە نزیکترین هاوەڵی ئەو.

جا خۆ لەو کاتەدا دەنگوباسی هاتنی دوایین پێغەمبەر ببووە باس و خواسی هەموو کۆڕ و دانیشتنەکان. تەورات و ئینجیلیش چەندین مژدەیان تێدابوو لەوبارەیەوە. بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکر هەرگیز چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد خۆی ببێتە نزیکترین دۆست و هاوەڵی ئەو پێغەمبەرە.




Gül Devri -2 Hz. Ebubekir

نرخی ٣٠٠٠ دیناره

İRFAN PUBLISHING